ن. ف. گۆگۆل و ئە. س. پووشکین







# لووت و کرێوە

دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف
لە ڕووسی‌یەوە کردوونی بە کوردی

محمدی مەلاکریم
پیایانداچووەتەوەو دایڕشتوونەتەوە

ن. ف. گۆگۆل و ئه.س.پووشكین

# لووت و كڕێوه

دوكتۆر
ئه‌وڕه‌حمانی حاجی مارف

له ڕووسی‌یه‌وه كردوونی به كوردی

محه‌مه‌دی مه‌لاكریم

پیایانداچووه‌ته‌وه‌و دایڕشتوونه‌ته‌وه

---

له چاپخانه‌ی ( عه‌لاء ) له به‌غدا له‌چاپدراوه

١٩٨٣

## - ١ -

٢٥ی مارت شتێکی سەیرو سەمەرە لە پێتێربورگ ڕووی‌دا . ئیڤان یاکۆڤلێڤیچی سەرتاش کە لە شەقامی ڤۆزنێسێنسکی دەژیا [ نازناوی فەوتابوو ، تەنانەت ئەو تەختەیەش کە وێنەی ڕوومەتی سابوون لێدراوی گەورەیەکی لەسەر کێشرابوو و لەسەری نووسرابوو « خوێنیش دەگرین »[1] ــ لەوە زیاتری پێوە نەبوو ] ، سبەینێ زۆر زوو خەبەری بووەوەو بۆنو بەرامەی کولێرەی گەرم هاتە لووتی . کەمێ سەری لەسەر جێگەکەی هەڵبڕی ، بینی وا کەیبانووە بەڕاستی بەڕێزەکەی کە زۆر حەزی لە قاوە خواردنەوە دەکرد ، خەریکە کولێرەی تازەو گەرم لە تەنوورەکە دەکاتەوە . ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ بە ژنەکەیی گوت :

ــ پراسکۆڤیا ئۆسیپۆڤنا ! من ئەم بەیانی‌یە قاوە ناخۆمەوە . حەزدەکەم کولێرەی گەرم بە پیازەوە بخۆم .

واتە : ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ حەزی لەمیش‌و لەویش دەکرد ، بەڵام دەیزانی بە هیچ چەشنێك نابێ لە یەك ژەمدا داوای دوو شت بکات ، چونکە پراسکۆڤیا ئۆسیپۆڤنا زۆر ڕقی لەو جۆرە ئارەزووانە بوو .

---

(١) مەبەستی لە کەڵەشاخ گرتنە . جاران سەرتاش کەڵەشاخیشیان دەگرت ــ وەرگێڕ .

« لێ گەڕێ با کەرە کولێرە بخوا . بۆ من ئەوە باشترە . بەشی ژەمێك قاوە دەمێنێتەوە » . ژنە ئەمەی لە دڵی خۆیدا گوتو کولێرەیەکی بۆ تووڕ هەڵدایە سەر مێزەکە .

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ ، بۆ نەزاکـەت ، چاکـەتەکەی بەسەر کراسەکـەیدا لەبەرکردو ، هەر کە لە پشت مێزەکەوە دانیشت ، هەندێ خوێی داکردو دوو سەلك پیازی ئامادە کرد . چەقۆکەی هەڵگرت ویستی کولێرەکە کەرت کەرت بکات . کە خەریك بوو کەرت کەرتی دەکرد تەماشای ناوەکەی کرد ، بـە سەرسامی‌یەکەوە دیتی شتێك تێیدا سپی دەچێتەوە . بەهێواشـی بە چەقۆکـە هەویرەکەی لەسەر لاداو پەنجەیەکی لێ‌داو لە دڵی خۆیدا گوتی : « ڕەقـە ! دەبێ چی بێ ؟ » .

پەنجەی کرد بەناو کولێرەکەداو شتێـکی لێ دەرهێنـا . سەیری‌کرد : لووتە . دەستی بەردایەوە ، جا کەوتە هەڵگلۆفینی چاوی‌و دەست پێدا هێنانی . لووتە ، ڕەپ‌و ڕاست لووتە ! زیاد لەوەش وا دەهاتە پێش چاوی لووتی یەکێکی ناسیاو بێ . ترسی لێ نیشت ، بەڵام ئەم ترسە لەچاو تووڕەیی‌و ئاگرکردنەوەی ژنەکەیدا هیچ نەبوو .

ژنە بەقینەوە شیراندی : هەی دڕندە ! ئەوە تۆ ئەو لووتەت لەکوێ بڕیوە ؟ ساختەچیی سەرخۆش ! هەر خۆم خەبەرت لێ دەدەم . چۆن ڕێگرێکە ! من لە سێ کەسم بیستووە تۆ کە ڕیشی خەڵك دەتاشی ، هێندە لووتیان ڕادەکێشی ، بەئاستەم بە شوێنی خۆیەوە بمێنێ .

بەڵام ئیڤـان یاکۆڤلێڤیچ لەترساندا وای لێ هاتبوو نـە بڵێی ماوەو نە بڵێی مردووە . ئەو خۆی دەیزانی لە لووتی کۆڤالیۆڤ بەولاوە نی‌یە کە قوتابخانەی

فەرمانبەرانی تەواو کردووەو هەموو یەكشەمموانو چوارشەممموانێ سەرو ڕیشی لا چاك دەکرد .

ـ پراسکۆفیا ئۆسیپۆڤنا ! تۆ بوەستە من دەیخەمە پریاسکەیەکەوەو دەیپێچمەوەو لە پەنایەکدا دایدەنێم . لێی گەڕێ با ماوەیەکی کەم لەوێدا بێ ، دوایی دەیبەم .

ـ نامەوێ گوێ بۆ هیچ شل بکەم . من چۆن ڕێدەدەم لووتی بڕاو لە ماڵی مندا دابنرێ ؟ هەی دڵڕەقی بێبەزەیی ! هەر ئەوە دەزانی گوێزان بە قایشدا بهێنی . بەمزووانە بەتەواوی واتلێدێ توانات نەمێنێ ئەرکی سەرشانی خۆت جێبەجێ بکەی .. بێکەڵکی سواری سەری خەڵك بوو ! بەتەمای من لە پۆلیسخانە لەسەرت بکەمەوە ؟ ئاخ .. چەپەڵ ! بێمێشك ! بیبەدەرێ ، بۆ کوێی دەبەی ببە ! با لە بەرچاوی مندا نەمێنێ .

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ وایلێهاتبوو هەر دەتگوت کوژراوە . بیری کردەوە .. بیری کردەوە .. بەڵام نەیزانی چی بکات .

ئاخری دەستیبرد پەناگوێی خۆی خوراندو لەبەرخۆیەوە گوتی : مەگەر شەیتان بە شەیتانیی خۆی بزانێ ئەمە چۆن وا بووە . دوێنێ ئێوارە بە سەرخۆشی گەڕاومەتەوە بۆ ماڵ یان نە ؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە ناتوانم بەدڵنیاییەوە بڕیاربدەم ، بەڵام بە هەموو نیشانەیەکدا وا دەردەکەوێ دەبێ ڕووداوەکە شتێکی عادەتی نەبێ . کولێرە دیارە دەبرژێنرێ ، بەڵام ئەی لووت چپێوەندێکی بەمەوە هەیە ؟ هیچ سەری لێ دەرناکەم !

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ نقەی لێ بڕا . بیرکردنەوە لەوە کە پۆلیس لووتەکەی لا بدۆزێتەوەو تاوانی ئەوەی بدەنەپاڵ ، بەتەواوی وایلێکردبوو خەریكبوو

له هۆشی خۆی بچێ . یەخەی ئاڵی بــه تاڵی زیو چنراوو قەمەکەی لاقــەدی دەهاتە پێش چــاوو ... هەموو گیــانی دەکــەوتە لەرزەلەرز . ئاخرێکــەی دەستی‌برد هەرچی جله شڕەی هــەبوو هەڵی‌گرت‌و لەبەری‌کردن‌و پۆســتاڵە دڕاوەکەشی لەپێ‌کردو لووتەی له پەڕۆیەکەوە پێچاو لەگەڵ کۆمەڵێ ئامۆژگاریی قورس‌و گرانی پراسکۆڤیا ئۆسیپۆڤنادا چووەدەرێ .

ویستی له شوێنێکدا بیشارێتەوە ئیتر هەرکوێ بێ یان بیخاتە درزی ژێر دەرگایەکەوە یان بەری‌داتەوە وەك بەرێکەوت له دەستی کەوتبێتە خوارەوەو بۆخۆی بگەڕێتەوە خۆی بکا بە کۆلانێکدا ، بەلام بۆ نەگبــەتی لــه هــــەر هەنگاوێکدا تووشی بە تووشی ناسیاوێکەوە دەبوو لێی‌دەپرسی : « بۆکـــوێ دەچی ؟ » یاخود : « بەم بەیانی‌یە زووە نیازی تاشینی ڕیشی کێت هەیە ؟ » . بەم‌جۆرە ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ دەقیقەیەك چی‌یە وەختی دەسگیر نەبوو . تا لەپــڕ هەستی‌کرد کەس دیار نی‌یە ، پریاسکەکەی بەردایەوە . هێشتا پریاسکەکــه نەکەوتبوە سەر زەوی ، یەکێــك لەدوورەوە هاواری‌لێ‌کرد : « شتێکت لــێ بەربووەوە ، هەڵی‌گرەوە ! » . ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ ناچار لووتەی هەڵگرتەوەو لە گیرفانیدا شاردیەوە . بەتەواوی هیوای بڕا ، بەتایبەتی چونکه دەرگای دووکان‌و کۆگاکان دەکرانەوەو خەڵك لەسەر شەقامەکان زۆر دەبوون .

بڕیاری‌دا بەرەو پردی ئیساکییێفســکی بڕوا : تــۆ بڵێی هەڵیــکی بۆ هەڵنەکەوێ فڕێی‌داتە ڕووباری نیڤاوە ؟ بەلام من تاڕادەیەك خەتابارم کە تائێستا لەبارەی ئیڤان یاکۆڤلێڤیچەوە ــ کە لە زۆر ڕووەوە مرۆیەکی بەڕێزە ــ هیچم نەگوتووە .

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ ، وەك هەر وەستایێکی ڕێکوپێکی ڕووس ، ئارەقخۆرێکی بێ‌ئامان بوو . هەرچەند هەموو ڕۆژێ ڕیشی خەڵکی دەتاشی ، ڕیشی خۆی

هەمیشە هەر نەتاشراو بوو • کورتەکەکەی ئیڤان [ ئیڤان هەرگیز چاکــەتی لەبەرنەکردبوو ] پەڵە پەڵە بوو ، واتە ڕەش بوو ، بەڵام سەر تا دامانی پـەڵەی زەردو سوورو مۆری ئاوی میوە بوو • یەخەکەی دەبریسکایەوە • لەبریتیی سێ قۆپچەکەی تەنیا دەزووەکەیان مابوەوە • ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ پیاوێکی ئێجگار بێشەرم بوو • کـە کۆڤالیۆڤی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبـەران لە کـاتی ڕیش‌تاشینیدا پێی‌دەگوت : « ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ تۆ هەمیشە دەستت بۆگەنی لێوە دێ » ، ئەمیش لە وەڵامدا دەیپرسی : « دەبێ لە چی‌یەوە بۆگەنی بێ ؟ » • کۆڤالیۆڤی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەرانیش دەیگوت : « چوزانم ، براله ! لە چی‌یەوەیە • هەر ئەوەندە دەزانم بۆگەنی لێوەدێ » • ئیڤان یاکۆڤلێڤیچیش هەندێ بڕنووتیی دەکرد بە لووتیەوەو دەستی‌دەکرد بە سابوون لێدانی ڕوومەت‌و سمێڵ‌و پشت‌گوێ‌و ژێرچەناکەی کۆڤالیۆڤ‌و هەرکوێی‌تری خۆی ئارەزووی لێ بوایە •

ئەم هاووڵاتە بەڕێزە گەیشتە سەر پردی ئیساکیێڤسکی • بەر لە هەرچی سەیرێکی هەموو شوێنەکەی کرد • دوایی خۆی بەسەر محاجەرەی پردەکەدا شۆڕکردەوە ، وەك بڵێی دەیەوێ بزانێ ماسیی زۆری تێدا هەڵدەبەزێتەوە • لەسەرخۆ پریاسکەکەی لووتەکەی پێوە پێچابوو ، هەڵدایە خوارەوە • وای هەست‌کرد وەك بڵێی بەجارێك دە ڕبـە باری لەســەر شانی خۆی لادابێ • پێکەنینێکی گاڵتەپێ‌هاتووانەشی کرد • لەجیاتیی ئەوەش بچێ بۆ سەر ئیشەکەی ڕیشی فەرمانبەران بتاشێ ، هەنگاوی بـەرەو بارێك نا تەختــەیەکی پێــــدا هەڵواسرابوو لێی نووسرابوو « چایی‌و خواردەمەنی » بەنیازی ئەوەی پەرداخێك پوونش[1] بخواتەوە • بەڵام لەپڕ لەوسەری پردەکەوە پاسەوانێکی بەدی‌کرد

(١) پوونش : جۆرە خواردنەوەیەکە ــ وەرگێڕ •

به سەرو سیما پیاوانە ئەهاتــە پێش چاو : لاجانگی پان ، سدارە بەسەرەوە ، قەمە بە لاقەدیەوە بوو ٠ ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ لەترسان خەریك‌بوو ببوورێتەوە ٠ پاسەوانەکە بە پەنجە ئیشارەتی کردیۆ گوتی :

ـ ئا فەرموو ، تا ئێرە وەرە ٠

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ ، کە لە ئەتەکێت شارەزا بوو ، سووکێ چووە بەردەمیو هەر بەرلەوەی بگاتە بەرەوە کاسکێتەکەی داگرتو گوتی :

ـ جەناب ! هیوای تەندروستیتم هەیە ٠

ـ نەخەیر ٠٠ نەخەیر ٠٠ براله ! جەنابو مەنابی بێ‌ناوێ ٠ پێــم‌بڵێ ئەوە کە لەسەر پردەکە وەستابووی چیت‌دەکرد ؟

ـ گەورەم ! بە ذاتی خوا ، دەچووم بۆ سەرتاشخانەکەم ، سەرو ڕیشی خەڵك چاك‌بکەم ٠٠ بەڵێ هەروا سەیرم‌کرد بزانم ئاوەکە بەخوڕ دەڕوا ٠

ـ درۆ دەکەی ٠٠ درۆ دەکەی ٠٠ خۆت بەم قسانە ناپەڕێنیتەوە ٠ وەڵامی ڕاست بدەرەوە ٠

ـ گەورەم ! ئامادەم هەفتەی دوو جار ، یاخود تەنانەت سێ‌جاریش ڕیشت بۆ بتاشم بێ‌ئەوەی هیچ پێم گران بێ ٠

ـ نەخەیر ، برادەر ، قسەی پووچ دەکەی ٠ من سێ سەرتاش ڕیشم بۆ دەتاشن ٠ شانازی‌یەکی زۆریش بەوەوە دەکــەن ٠ باشتر وایە پێــم‌بڵێی لەوێ چیت‌دەکرد ؟

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا ٠٠ بەڵام ڕووداوەکە ئیتر لێرەدا

تەمومژ بەتەواوی دایدەپۆشیّو ، پاشتر چی ڕووی‌داوە ، ئەوە هیچ ئاشکرا نی‌یە .

## - ٢ -

کۆڤالیۆڤی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران سبەینیّ زۆر روو لە خەو خەبەری بووەوەو بە لێوەکانی ( برڕ ... )ێکی کرد ، وەك چۆن هەمیشە کە بەخەبەر دەهات وای‌دەکرد ، بەڵام خۆیشی نەیدەتوانی لێکی بداتەوە بۆچی وادەکات . داوای‌کرد ئاوێنە بچکۆلەکەی بدەنیّ کە لەسەر مێزەکە دانرابوو . دەیویست سەیرێکی ئەو عازەبەیە بکات کە دوێنیّ لەسەر لووتی دەرچووبوو ، بە سەرسووڕمانێکەوە بینی شوێنی لووتی یەك پارچە بووە بە شوێنێکی تەخت‌و ساف‌و لووس ! ڕاچنی . گـوتی ئاوی بۆ بێنن . ئاوێکی دا بە دەم‌و چـاویاو بە خاولی‌یەك سڕی : ڕەپو ڕاست وایە ، لووتی پێوە نی‌یە ! کەوتە نقورچ‌گرتن لە خـۆی تا بزانیّ بێـدارە یا خـەوەدەبینیّ ؟ نەخـەیر ، دیارە نەنووستووە . کۆڤالیۆڤی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران لەناو جێگاکەی ڕاپەڕی‌و خۆی ڕاتەکاند : لووت دیار نی‌یە . گوتی جلەکانی بۆ بێنن خۆی لەبەرکـاو ، بـە هەڵەداوان ڕاست بۆلای بەڕێوەبەری پۆلیس ڕێی گرتەبەر .

بەڵام دیارە پێویستە لێرەدا شتێك لەبـارەی کۆڤالیۆڤـەوە بڵێین تاکـو خوێندەوار بتوانیّ بزانیّ ئەم کابرایەی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبـەران چۆن جۆرە بابەتێك بوو . دەرچووانی قوتابخانەی فەرمانبـەران کـە لەڕێی وەرگرتنی بڕوانامەی زانستی‌یەوە ئەو ناوو نیشانەیان دەدرێتیّ ، بە هیچ چەشنێك ناکریّ لەگەڵ ئەو دەرچووانە بەراورد بکرێن کە لە قەوقاز پیّ‌دەگەیەنران .

ئەم دوانە دوو جۆری بەتایبەتی جیاوازن . دەرچووانی قوتابخانەی فەرمانبەران لە ڕێگای خوێندنەوەو .... بەلاّم ڕووسیا ولاّتێکی هێندە سەیرە هەر ئەوەندە باسی دەرچوویەکی قوتابخانەی فەرمانبەران بکەی ، گشت دەرچووانی قوتابخانەکانی فەرمانبەران ، هەر لە ( ڕیگا )وە بیگرە تا ( کامچاتکا ) ، هەموو بێ‌لێکدانەوە وادادەنێن باس باسی ئەوانە . جا وەرە بە هەمان دەستوور بیر لە هەموو پایەو ناوو نیشانەکانی‌کەیش بکەرەوە . کۆڤالیۆف دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەرانی قەوقاز بوو . هەمووی تەنیا دوو ساڵ بوو ئەو ناوو نیشانەی وەرکرتبوو . بۆیە یەك دەقیقە چی‌یە نەیدەتوانی لەیادی‌بکات . بۆئەوەش کە خۆی پتر سەنگین‌و ماقووڵ پیشان بدات ، هەرگیز خۆی بە دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران ناونەدەبرد ، بەڵکو هەمیشە بە خۆی دەگوت «مێجەر». کە هەروا لەسەر شەقام ژنێکی بەرۆك‌بەندفرۆشی دەبینی ، پێی‌دەگوت : « گیانەکەم ! گوێ‌گرە ، وەرە بۆ ماڵەوە . ماڵەکەم لە شەقامی سادۆڤایە . هەر ئەوەندە لە یەکێ بپرسی مێجەر کۆڤالیۆف لەم‌ناوە دەژی ؟ یەکسەر ماڵمانت پیشان‌دەدەن » . خۆ ئەگەر تووشی ئافرەتێکی جوان‌و شۆخ بوایە ، فەرمانێکی تایبەتیی دەدایەو پێی‌دەگوت : « ئازیزەکەم ، هەر ئەوەندە هەواڵی ماڵی مێجەر کۆڤالیۆف بپرسەو بەس .. » . لەبەر شتێکی وایە خۆشی‌و ئێمەش لێرە بەدواوە ئەم دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەرانە بە مێجەر ناودەبەین .

مێجەر کۆڤالیۆف کردبووی بە خوو هەموو ڕۆژێ بە شەقامی نێفسکیدا پیاسەی دەکرد . یەخەی کراسەکەی هەمیشە خاوێن‌و نەشەدراو بوو . لاجانگەکانی وابوون کە ئێستاش هێشتا بە تۆبۆگرافیکەکانی هەرێم‌و ناوچەکان‌و ئەندازیارە میعمارەکان‌و پزیشکە سوپایی‌یەکان‌و گەورە پیاوانی بەشە جۆربەجۆرەکانی پۆلیس‌و ، بە گشتی بە هەموو ئەو پیاوە بەڕێزانەوە

بەدیدەکرێن کە جووتێ ڕوومەتی گەش‌و گۆشتنیان پێوەیەو ، زۆر جوان دانسی بۆستۆن دەکەن • ئەم لاجانگانەی تا ناوەڕاستی ڕوومەتی هاتبوون‌و بەرەو لای لووتی داکشابوون •

مێجەر کۆڤالیۆف گەلێ مەدالیەی ئاقیق‌و دروشمی هەمەچەشنەی بە بەرۆکەوە بوو کە ( چوارشەممە )و ( پێنج‌شەممە )و ( دووشەممە )و شتی‌وایان لێ هەڵکەنرابوو • وا پێویستی کردبوو مێجەر کۆڤالیۆف بچێ بۆ پێتێربورگ • ئیشەکەی ئەوەبوو بۆ شوێنێکی شایان‌و گونجاوی ڕێ‌و شوێنی خۆی بگەڕێ • ئەگەر بۆی هەڵکەوێ ، ببێ بە جێ‌نشینی شارستانەوان‌و ، ئەگەر ئەوەشی بۆ نەلوا ببێ بە سەرۆکی دەزگایەکی دیارو گەورە • هەرچەند مێجەر کۆڤالیۆف دژی ژن‌هێنان نەبوو،تەنها بەومەرجە قایل دەبوو ژن‌بهێنێ کچە سەرمایەیەکی دووسەد هەزاریی بەدەمەوە بێ • ئێستا ئیتر خوێنەوار خۆی دەتوانێ بلێ دەبێ مێجەر کۆڤالیۆف کە لە جێگای لووتێکی لووت‌ئاسایدا شوێنێکی بێ‌مەعنای تەخت‌و ساف‌و لووسی بینی ، کەوتە چ‌حاڵەتێکەوە •

بۆ نەگبەتی هیچ عەرەبانەچی‌یەك لەسەر شەقامەکە پەیدا نەبوو • مێجەر کۆڤالیۆف ناچاربوو بە پێ بکەوێتەڕێ • بارانی‌یەکەی لە خۆی پێچابوو و دەم‌وچاویشی بە دەستەسڕێك داپۆشیبوو • وای پیشاندەدا وەك بلێی خوێنی لووتی بەربووبێ • لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە : « بەڵام ، بەڵکو وا هاتبێتە پێش چاوم ، ئەگینا لووت چۆن هەروا لە هیچە ون‌دەبێ ! » • خۆی کرد بە دووکانی کێك‌فرۆشێکدا ، بەنیازی ئەوەی لە ئاوێنەدا سەیری خۆی بکا • بەخت هێنای ، دووکانەکە کەسی لێ نەبوو • شاگردە مناڵەکان دووکانەکەیان پاك‌دەکردەوەو کورسی‌یەکانیان ڕێك دەخست • هەندێکیشیان بە چاوی خەواڵووەوە سینی‌یە کێکی گەرمیان هەڵگرتبوو • ڕۆژنامەی قاوە بەسەردا

ڕژاوی دوێنێ ئێواره لەسەر کورسیو مێزەکان کەوتبوو • بەخۆشی‌یەوە لەبەرخۆیەوە گوتی : « خوا شوکر ، کەسی لێ نی‌یە • ئێستا دەتوانم سەیرێکی خۆم بکەم » • بەترسەوە بەرەولای ئاوێنەکە چوو و تفێکی ڕۆکردو گوتی : « مەگەر شەیتان بزانێ شتێکی چەند قۆڕو بێ‌مەعنایە هیچ نەبێ لەجێی لووتم شتێك هەر هەبوایە •• بەڵام هیچیش نی‌یە !• » •

بە ماتەمینی‌یەکەوە هەردوو لێوی خۆی گەست • لە دووکانی کێك‌فرۆشەکە چووە دەرەوەو بڕیاری‌دا کەوا بەپێچەوانەی ڕەوشتی عادەتیی خۆی بکا : بۆ کەس نەڕوانێو بەدەم کەسەوە پێ‌نەکەنێ •لەناکاو وەك بزماری داکوتراو لە بەردەمیماڵێکدا چەقی • ڕووداوێ لە بەردەمیدا ڕووی‌دا نەیزانی چۆنی لێك‌بداتەوە : عەرەبانەیەك لە بەردەرگای ماڵێکدا وەستا ، دەروازەی ماڵەکە خرایە سەرپشت ، ئاغایەك کە بەرگی‌ڕەسمیی لەبەردابوو ، سەری دانەواندبوو ، لە عەرەبانەکە بازی‌دایە خوارەوەو بەهەڵەداوان بە پلەکانی ماڵەکەدا سەرکەوت • کۆڤالیۆڤ کە دەس‌بەجێ ناسی‌یەوە لووتەکەی خۆیەتی ، لەباتیی ئەوەی سەری سووڕ بمێنێ ، دڵەکوتەیەکی سەیری تووش‌بوو • ئەم شتە ناعادەتی‌یە کە دیی ، وای‌لێ‌کرد هەموو شتێك لەپێش چاوی بخولێتەوە • هەستی‌کرد بەزەحمەت دەتوانێ خۆی بەپێوە ڕابگرێ ، بەڵام بڕیاری‌دا هەرچۆنێ بووەو هەرچی قەوماوە چاوەڕوانی بکا لووتە بگەڕێتەوە بۆ ناو عەرەبانەکەی • گیانی هەموو دەلەرزی ، دەتگوت لەرز دەیگرێ • پاش دوو دەقیقە لووتە هاتەدەرێ • بەرگێکی ڕەسمیی بە داوی زێڕین چنراوی لەبەردابوو بە یەخەیەکی گەورەو بەرزو ڕەقەوە ، پانتۆڵی چەرم لەپێداو ، قەمە بە لاقەدەوە• بە شەپقەی پەڕ پێوەکراویدا وابێ‌دەچوو لە پلەی ڕاوێژ پێ‌کراواندا بێ • بە هەموو نیشانەیەکدا وا دەردەکەوت بۆ شوێنێك دەرچووە بۆ دیدەنی•تەماشایەکی

ئەم‌لاو ئەولای خۆی کـردو سوار بووەوە ، نەڕانـدی‌یە عەرەبانەچی‌یەکە : « خێراکە ! » و دانیشتو ڕۆیی •

کۆڤالیۆفی کلۆڵ تۆزێکی مابوو شێت بێ • نەیدەزانی چـــۆن لـەو ڕووداوە سەیرە بگات • چۆن دەلوێ لووتێك کەوا دوێنێ بە سەروچاویەوە بووە ، لووتێ کە ناتوانێ هاتوچۆ بکا ، ئێستا بـەرگی ڕەسمیی لەبەرکردبێ ! کەوتە ڕاکردن بەدوای عەرەبانەکەدا کە لە بەختی ئەودا دوور نەڕۆیشتو لە بەردەم کڵێسەی کازانسکیدا وەستا •

کۆڤالیۆف بەپەلە خۆی‌کرد بەناو کڵێسەکەدا • دڕی بەڕیزی ئەو پیرێژنە دەرۆزەکەرانە دا کە دەم‌وچاویان داپۆشیبوو و تەنها دوو کونیان بۆ چـاویان هێشتبوەوە ، ئـەو پیرێژنانەی جاران پێ‌یـان پێ‌دەکـەنی • نوێژکەرانی نـاو کڵێسەکە زۆر نەبوون • هەموویان لای دەرگاکەوە وەستابوون • کۆڤالیۆف هێندە هەستی بە زەبوونی‌و بێ‌تاقەتیی خۆی دەکرد ، هێزی ئەوەی نەبوو نوێژ بکا • چاوی بە هەموو سووچ‌و قوژبنێکدا گێڕا بۆ دۆزینەوەی ئاغا • لەئەنجامدا دیتی لەلایەکەوە وەستابوو • لووتە دەم‌وچاوی خۆی بەتەواوی بە یەخە گەورەو بڵندەکەی داپۆشی‌و خۆی وا پیشاندا کەوا نوێژ دەکا •

کۆڤالیۆف بیری کردەوە : « چۆن بچمە لایەوە ؟ بە هەموو شتێکدا ، بە بەرگیدا ، بە شەپقەکەیدا دیارە کەوا ڕاوێژپێ کراوی شارستانی‌یە ••مەگەر هەر شەیتان سەری لێ دەرچێ ئەم کارە چۆن بەئەنجام دەگەیەنرێ » •

لە نزیکیەوە دەستی‌کرد بە کۆکەکۆك ، بەڵام تاقە دەقیقەیەك چی‌یە لووتە دەستی لە نوێژەکەی هەڵنەگرت ، هەر خەریك بوو •

کۆڤالیۆف زۆری لە خۆی کرد گوڕێکی بێتەوە بەبەرداو گوتی :

ـ گەورەی دڵنەرم •• گەورەی دڵنەرم ••

لووتە لایەکی کردەوەو گوتی : چیت دەوێ ؟ •

ـ گەورەی دڵنـەرم ! لام سەیرە •• من وا تێدەگـەم تۆ دەبێ بزانی شوێنی خۆت لەکوێیە ، کەچی ئەوەتا لەناکـاو دەتدۆزمەوە •• لەکـوێ ؟ لەکڵێسە •• توخوا وانییە ؟

ـ لێم ببوورە •• من لەم قسانەی تۆ حاڵی نابم •• ئەوە تۆ دەڵێیچی ؟ ڕوونی کەرەوە •

کۆڤالیۆف بیـری کـردەوە : « چـۆنی بۆ ڕوون کـەمەوە ! » ورەی خۆی کۆکردەوەو دەستیپێکرد :

ـ بێگومان من •• بە هـەرحاڵ من مێجـەرم • باوەڕت هـەبێ بۆ ن ناگونجێ لووتم نـەبێ • ئافرەتێـکی فرۆشیار لەسەر پردی ڤۆسکرێسێنسکی پرتەقاڵی پاككراو بفرۆشێ قەیدناکا بێلووت بژی ، ئەگەر مەبەست وەرگرتن بێ •• بەڵام من لەگەڵ خانمی زۆر ماڵ ناسیاویم هەیە ، وەك چێختاریۆڤای ژنە ڕاوێژبێکراوی شارستانیو •• کەسانیتر •• تۆ خۆت بڕیاربدە ، گەورەی دڵنەرم ، من نازانم •• [ لێرەدا مێجەر کۆڤالیۆف شانەکانی دێنێتەوە یەك ] •• لێم ببوورە •• ئەگەر بە ئوسووڵی پێویستو شەرەف سەیری مەسەلەکە بکەین ، خۆت دەتوانی تێیبگەیت ••

لـووت وەڵامی دایەوە : « بـەڕاستی هیـــچ حاڵی نـەبووم • باشتری ڕوونکەرەوە » •

کۆڤالیۆف بە هەستێکی خۆ بـە قورس گرتنـەوە گوتی : « گـەورەی

دڵنەرم •• من نازانم چۆن لە قسەکانی جەنابت بگەم •• لاموایە مەسەلەکـە بەتەواوی ڕوونو لەبەرچاوە •• یاخود تۆ دەتـەوێ •• ئاشکرایـە تۆ لووتی منی •• » •

لووتە تەماشایەکی مێجەری کردو برۆکانی هێنایەیەکو گوتی :

ـ گەورەی دڵنەرم ! بەهەڵەدا چوویت • من خۆم بە خۆمەوەم • منو تۆ هیچ پێوەندی‌یەکی پێکەوەمان نی‌یە • بە دوگمەکانی بەرگە وەکیلی‌یەکەتدا، دیارە دەبێ تۆ لە مەیدانێکی‌تردا کار بکەیت •

لووتە ئەمەی گوتو ڕووی وەرگێڕاو کەوتەوە نوێژکردن •

کۆڤالیۆف بەجارێ سەری لێ شێوا • نەیـدەزانی چی‌بـکا • تەنانەت نەشی‌دەزانی بیر لە چی بکاتەوە • لەو ساتەدا خشەیەکـی ناسـکی کراسـی ئافرەتێکی کەوتە بەرگوێ • ئافرەتێکی بەساڵاچوو ، کە کراسەکەی هەموو بە ئۆیە ڕازابوەوە ، هات ، کچێکی شۆخی باریکەلەی لەگەڵ بوو ، کراسـێکی سپی کەمەرتەنگی لەبەردابوو قەوارەی باڵای بە وردی پیشان‌دەدا ، شەپقەیەکی بووش ڕەنـگی سووکـی بـەسەرەوە بوو هەر دەتگوت کێکە • نۆکـەرێکی باڵابـەرزیش بە جووتێ لاجانـگی پـانو دەرزەنێکی تەواو یەخەوە لەپشت سەریانەوە ڕاوەستابوو ، قووتوویەکی کراوەی بڕنووتیی بەدەستەوە بوو •

کۆڤالیۆف چووە پێشەوە لێیان ، یەخەو بەرۆکبەندەکەی ڕێککرد • مەدالیە بە زریزەی زێڕینەوە هەڵواسراوەکانی سەرسنگی ڕاستکردەوە • بە زەردەخەنەیەکەوە سەیرێکی ئەملاو ئەولای کرد • دیقەتی لە کچـە شۆخە ناسکەکـە دا کـە وەک گوڵی بەهاران تۆزێک خـۆی لار کـردبوەوەو دەستە سپی‌یەکەی بە پەنجە نیمچە شەفافەکانیەوە هەڵبڕیبوو بۆ سەر ناوچـەوانی •

کۆڤالیۆف که لەژێر شەپقەی کچەوە چەناگەی خڕی سپیو لایەکی کوڵمی ئاڵی وەك گوڵەباخی تازە پشکووتووی نەوبەهاری بینی ، زەردەخەنەیەك هەموو ڕووی گرتەوە ، بەڵام لەپڕ وەك ئاگر شاڵاوی بۆ هێنابێ گەڕایە دواوە ، بیری کەوتەوە کەوا لووتی هیــچ پێوە نی‌یە . فرمێسك زایە چاوەکانی . بڕیاریدا ڕەپو ڕاست بە ئاغا بەرگی ڕەسمی لەبەرەکە بڵێ تۆ لەخۆتەوە خۆت کردووە بە ڕاوێژبێ کــراوی شارستانی ، ئەگینــا لەڕاستیدا کابرایــەکی کەڵەکــبازو حەرامزادەیتو لەوە بەولاوە کە لووتی منی ، هیچی‌کە نیت .. بەڵام لووتە دیار نەمابوو . دیاربوو فریاکەوتبوو تێی‌تەقێنێو سەرلەنوێ بچێ بۆ دیــدەنی کەسێکی‌کە .

ئەمە نائومێدیی خستە دڵی کۆڤالیۆف . پاشەوپاش گەڕایەوەو دەقیقەیەك لای پایەکاندا وەستا . بەوردی سەیری هەموولایەکی کرد ، بەڵکو ئەمە خوایە لووتە بدۆزێتەوە . زۆر چاك لەیادی‌بوو کە شەپقەکەی پەڕی پێوە کرابوو و جلەکــانی بە داوی زێڕین ڕازابوونــەوە ، بەڵام سەرنجــی نــەدابووە پاڵتۆ ڕەسمی‌یەکەیو ڕەنــگی عەرەبانەکەیو ئەسپەکــانی . تەنانەت نەشی‌دەزانی نۆکەری لەدواوە بوو یان نەو ، ئەگەر بوو چجۆرە جلێکی لەبەردابوو . زیاد لەوەش عــەرەبانە لەوناوەدا ئەوەندە زۆر بوونو هێنــدە بەخێرایی دەهــاتنو دەچوون ، تەنانەت ناسینەوەشیان زەحمەت بــوو . خــۆ ئەگــەر یەکێکیشیانی دەست‌نیشان بکردایە ، هیچێکی‌وای شك‌نەدەبرد ڕای‌بگرێ پێی . ڕۆژەکەی ڕۆژێکی خۆشو هەتاو بوو . شەقامی نێڤسکی خەڵکێکی زۆری تێ‌ڕژابوو . پۆلی ژن وەك شەپۆلی گوڵ هەر لە پردی پۆلیتسێیسکی‌یەوە تاپردی ئەنیچکین بە هەردوو بەری شەقامەکــەدا جمەیان دەهات . ئــەوەتا ناسیاوێکی کــە لە قوتابخانەی حەوت ساڵیی فەرمانبەران دەرچووەو بانگی لێ دەکرد : سەرگورد

ـ نەخوازەڵا ئەگەر بێگانەیەك لەویادا بوایە ـ بەرەو پیری دێت • ئەوەش یاریژ کینی هاوڕێی نزیکی کە بەڕێوەبەری بەشێك بوو لە ئەنجومەنی پیران‌و هەمیشە لە یاریی بۆستۆندا دەیبردەوە • ئەوەش مێجەرێکی‌تر ، ئەمیش وەك خۆی قوتابخانەی فەرمانبەرانی لە قەوقاز تەواو کردووە،دەستی لێ ڕادەتەکێنێ‌و بانگی دەکا بچێ بۆ لای •

کۆڤالیۆڤ گوتی : شەیتان بتباتەوە بۆ خۆی! بە عەرەبانەچی‌یەکەشی گوت: هێی ! هەر ڕاست بۆ لای بەڕێوەبەری پۆلیس •

سواری عەرەبانۆچکەکە بوو • هەر هاواری بوو ، دەیخوڕی‌یە عەرەبانەچی‌یەکە : « خێرا لێ‌خوڕە ، بە هەموو هێزت ! » •

هەر کە گەیشتە بەردەرگای پۆلیسخانەکە ، هێشتا لەدەرەوە بوو هاواری‌کرد : « بەڕێوەبەر لەوێ‌یە ؟ » •

دەرگاوان وەڵامی دایەوە : « لێرە نی‌یە • هەر ئێستا دەرچوو » •

ـ ئەمجارەش نەیهێنا !

دەرگاوانەکە دیسانەوە گوتی : « بەڵێ زۆر نی‌یە ڕۆیشت •• بەڵام ڕۆیشت •• دەقیقەیەك زووتر بهاتیتایە ، لەوانەبوو فریای بکەوتیتایە » •

کۆڤالیۆڤ بێ‌ئەوەی دەستەسڕەکەی لە دەم‌وچاوی بکاتەوە ، سواری عەرەبانەکە بووەوەو بە دەنگێکی دڵگیری پڕ لە نائومێدی شیڕاندی :

ـ لێ‌خوڕە !

عەرەبانەچی‌یەکە گوتی : بۆکوێ ؟

ـ ڕاست بڕۆ !

– چۆن ڕاست برۆم ؟ لێرەدا پێچە . بەرەو لای ڕاست لێخوڕم یا بەرەو لای چەپ ؟

ئەم پرسیارە کۆڤالیۆڤی ڕاگرت‌و ناچاری کرد سەرلەنوێ بکەوێتەوە بیرکردنەوە . لەم وەزعەیدا پێویست بوو لەسەری بەر لە هەرچی بڕوا بۆ بەڕێوەبەرێتیی ئوسووڵ پارێزی ، نەك لەبەرئەوە کە ئەو بەڕێوەبەرێتی‌یە ڕاستەوخۆ پێوەندی بە پۆلیسەوە هەیە ، بەڵکو چونکە لەوانەبوو کارەکەی لەوێ لە هەر لایەکی‌کە خێراتر مەیسەر بێ . بەڵام گەڕان لەدووی چارەیەك لەو شوێنەی کە لووت گوتبووی لەوێ فەرمانبەرم ، کارێکی بێ‌سوود بوو ، لەبەرئەوە کە لە وەڵامەکانیەوە بەئاشکرا دیاربوو هیچ شتێ بەلایەوە قیمەتی نی‌یەو ، وەك چۆن ئەوجارە درۆی لەگەڵ کرد ئێستاش هەر بەوچەشنە دەتوانێ درۆی لەگەڵ بکا . کۆڤالیۆف خەریك‌بوو فەرمان بە عەرەبانەچی‌یەکە بدا لێخوڕێ بۆ بەڕێوەبەرێتیی ئوسووڵ‌پارێزی ، لەپڕ سەرلەنوێ بەبیریدا هات کەوا ئەو کەڵەکبازو ساختەچی‌یەی لە یەکەم چاوپێکەوتندا وا بێ‌شەرمانە لەگەڵی جووڵایەوە ، ئێستاش دیسانەوە دەتوانێ هەلێ بدۆزێتەوەو لە چاوتروو کاندنێکدا دەرباز بێ‌و لە شار بچێتەدەرێ . ئەوسا ئیتر هەرچەند بەدوایدا بگەڕێ بێ‌ئەنجام دەبێ‌و هیچی لێ دەسگیر نابێ ، یاخود خودا نەکەردە دەبێ درێژە بکێشێ‌و لەوانەیە مانگێکی ڕەبەق بخایەنێ . سەرەنجام وای هەست‌کرد وەك بڵێی سرووشی لە ئاسمانەوە بۆ هاتبێ . بڕیاری‌دا ڕاستەو ڕاست بچێ بۆ ئۆفیسی جاڕنامە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکان‌و هەموو نیشانەکانی لووتە بنووسێ‌و بڵاوی بکاتەوەو داوابکا هەرکەس بینیی یەکسەر بۆی بهێنێتەوە ، یاخود هیچ نەبێ هەواڵی ئەو شوێنە بگەیەنێ کە لێیەتی . بەم‌جۆرە بڕیاری‌دا بە عەرەبانەچی‌یەکە بڵێ بەرەو ئۆفیسی جاڕنامە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکان لێخوڕێ . تا

گەیشتیشنەجێ هەر مستەکۆڵەی بە پشتی عەرەبانەچی‌یەکەدا دەماڵی‌و هـــەر سیخورمەی تێوە دەژەندو بەسەریدا دەنەڕاند • « خێرا لێ‌خوڕە ناجسن ! خێرا حەرامزادە ! » • کابرای عەرەبانەچی‌یش دەیگوت « ئاخ ! ئاغە » و ســەری ڕادەوەشاندو قایم دەیکێشا بە ئەسپەکەدا کەوا تووکی وەك تووکی سەگی کوڵکن درێژ بوو • سەرەنجام عەرەبانۆچکەکە وەستاو کۆڤالیۆف بەهەڵەداوان خۆی کرد بە ژوورێکی بچووکی هەواڵزانیدا کـە فەرمانبـەرێکی سەرسپی لەپشت مێزێکەوە لێ دانیشتبوو ، چاکەتێکی کۆنی لەبەرداو جووتێ چاویلکەی لە چاو نابوو • ئووچەکەشی گرتبوو بە ددانیەوە خەریکی ژماردنی ئەو پارە وردەیە بوو کە بۆیان هێنابوو •

ـ کێ لێرە جاڕنامە وەردەگرێ ؟ کۆڤالیۆف قیژاندی‌و بەدوایدا گوتی : لێم‌ببوورە ، ڕۆژباش !

ـ لەخزمەتدام • فەرمانبەرە سەرسپی‌یەکە ئەمەی گوت‌و بۆ کەمێك چاوی هەڵبڕی‌و دایخستەوە بەسەر کۆما پارەکانی سەر مێزەکەدا •

ـ دەمەوێ شتێك بڵاوبکەمەوە •

ـ فەرموون •• بێ‌زەحمەت تۆزێ ڕاوەستن • ئەمەی گوت‌و بە دەستێکی ژمارەیەکی لە قاقەزەکەی بەردەمی نووسی‌و بە دەستەکەی‌کەشی دوو دوگمەی پارەژمێرەکەی جووڵاند •

خزمەتکارێك کە بە جل‌وبـەرگە قەیتانـدارە ڕازاوەکـــەیدا دیـاربوو خزمەتکاری گەورەماڵانە ، لەتەنیشت مێزی فەرمانبەرەکەوە وەستابوو ، قاقەزێکی بەدەستەوە بوو • وای بە باش زانی هەندێ وێڵ‌و ماریفەت بنوێنێ :

ـ جەناب ! بڕوا بکە سەگەکە هەشتا کۆپێك ناهێنێ ، واتە ئەگەر من بم بە

هەشتا کۆپێك نایکڕم ، بەڵام خانم خۆشیدەوێ .. ئەری وەڵڵا خۆشیدەوێو ئەوەتە سەد ڕووبڵ دەدا بە هەرکەس بیدۆزێتەوە . بەڵێ ئەگەر بەگوێـرەی ئوسووڵ قسە بکەین ، وەك چۆن منو تۆ قسە دەکـەین ، دەبێ بڵێین زەوقی خەڵك لەناو خۆیاندا جیایە . تۆ ئەگەر ڕاوچی بیو سەگێك یان تانجییـەك بەکەنبکەی ، حەیف نییە پێنجسەد یا هەزاریشی بدەیتێ ، هەر بەومەرجەی چاك بێ .

فەرمانبەری بەشەرمو شکۆ بە دڵپێدانەوە گوێی بۆ ئەو قسانە ڕادەگرتو لە هەمانکاتیشدا خەریکی حیسابی خۆی دەبوو ، پیتەکانی هەر قاقەزێکی دەژمارد کە دەهێنرانە بەردەستی . پیرێژنو نۆکەرو بەردەستی بازرگانان بەزۆری لەملاو لەولایەوە لەناو ژوورەکەدا وەستابوون . لە جاڕنامەیەك لە جاڕنامەکانی بەردەستیدا نووسرابوو عارەبانەچییەکی هێمنو لەسەرخۆمان هەیە دەیدەین بە کرێ . جاڕنامەیـەکیتریان باسی فرۆشتنی عارەبانەیەکی کـەمبەکارهێنراوی تێـدا نووسرابوو کە ساڵی ١٨١٤ لە پاریسەوە هێنابوویان . جاڕنامەیەکیکەش لەمەڕ کچێکی نۆزدە ساڵان بوو کـە لە کـاری جلشتندا قاڵبووبوو و بۆ هـەموو ئیشێکیتریش دەستیدەدا . یەکێکیکـەش لەبارەی عارەبانـەیـەکی سووکی کەلوپەل گواستنەوەوە کە زەنبەلەکێکی ناتەواو بوو ، لەبارەی ئەسـپێکی شێی هەڵقونو داقونکـەری حەڤدە ساڵانـەوە ، لەبارەی تۆوی تازە لە لەندەنەوە گەیشتووی شێلمو توورەوە ، لەبارەی خانوویـەکی هاوینەوە بە هەموو ئـەو بەشانەیەوەکە لەگـەڵێنی : دوو تەویلەی وڵاخبەستنەوە ، پارچـە زەوییـەك لەتەنیشتیەوە بۆ ئەوە دەشێ بکرێ بە باخێکی چاکی چنارو سپیدار . هەر لەناو جاڕنامەکاندا جاڕنامەیەکیش هەبوو بۆ بانگکردنی خەڵك هەموو ڕۆژێ لە سەعات هەشتی بەیانییەوە تا سێی پاش نیوەڕۆ بچن بۆ سەیری مەزاتی جلو

پێڵاوە کۆن • ئەو ژوورەی ئەو هەموو خەڵکەی تێ‌ڕژابوو ، ژوورێکی بچووك بوو ، هەوای تێدا پیشاوو پەنگی خواردبوەوە • بەڵام کۆڤالیۆڤی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران بۆنی نەدەکرد ، چونکە دەم‌وچاوی بە دەسنەسڕێ داپۆشیبوو • لووتیشی مەگەر خوا خۆی بیزانیایە لەکوێ‌یە •

کۆڤالیۆف سەرەنجام خۆی پێ ڕانەگیرا ، بە فەرمانبەرەکـەی گـوت : « گەورەی دڵ‌نەرم ! ڕێگام بدە داوات لێ بکەم •• زۆرم پێویستە داوات لـێ بکەم •• » •

ـ هەر ئێستا •• هەر ئێستا •• دوو ڕووبڵو سێ کۆپێك هەر ئێستا •• ڕووبڵێك‌و شەست‌و چوار کۆپێك•• پیرەی سەرسپی ئەمەی گوت‌و جاڕنامەکانی بە سەرو چاوی پیرێژن‌و نۆکەرەکاندا هەڵدا • جا ڕووی‌کردە کۆڤالیۆف‌و لێی‌پرسی : فەرموو چیت‌دەوێ ؟

کۆڤالیۆف گوتی : تکات لێ دەکـەم •• من خـۆم تائێستاش تێ‌ناگـەم هەڵخەڵەتاوم یا فێڵیان لێ کردووم •• تەنها ئەوەندەت لێ داوا دەکەم ئەوەم بۆ بڵاوبکەیتەوە کەوا هەرکەسێ ئەو ساختەچی‌یەم بێنێتەوە بەردەست خەڵاتێکی چاك وەردەگرێ •

ـ بێ‌زەحمەت ناوت چی‌یە ؟

ـ نەخەیر •• ناوی بۆچی‌یە ؟ ناتوانم ناوی خۆم بڵێم • ناسیاوم زۆرە •• خاتو چێختاریۆڤای ژنە ڕاوێژبێ‌کراوی شارستانی••خاتو پاڵاگیـا گریگۆریێڤنا پۆدتۆچینای ژنە ئەفسەر •• پەنابەخوا ئەگەر لەپڕ پێ‌بزانن ! ئێوە دەتوانن هەر ئەوەندە بنووسن : دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران ، یاخود لەوەش باشتر : ئەفسەر لە پلەی مێجەریدا •

ـ کابرا کە هەڵاتووە لات خزمەتکارتە ؟

ـ خزمەتکاری چی ؟ خزمەتکار بوایە هەڵاتبوایە ، کەڵەکبازی‌یەکی ئەوتۆ نەدەبوو ! لووت هەڵهاتووە لە دەستم لووت ..

ـ همم .. ناوێکی سەیرە !. جا ئەم لووت ئاغایە پارەیەکی زۆری لێ دزیوی ؟

ـ لووت .. واتە .. تۆ بیر لە شتێکی‌کە دەکەیتەوە . لووت .. لووتی خۆم دیار نەماوەو نازانم کەوتووەتە کوێوە ؟ شەیتان حەزی‌کردووە پێم ڕابوێرێ !

ـ باشە ، بەڵام چۆن ونبووە ؟

ـ ئاخ ! ناتوانم بۆت باس‌کەم چۆن ! بەڵام ئەوەی مەبەستە ئەوەیە ئێستا بەناو شاردا دێ‌و دەچێ‌و خۆی بە ڕاوێژبێ‌کراوی شارستانی لەقەڵەمدەدا . بۆیە تکات لێ دەکەم جاڕنامەیەکم بۆ بڵاوبکەرەوە تێیدا بنووسە ئەوەی بیگرێ ، دەست‌بەجێ بۆم بێنێتەوە . تۆ خۆت بڵێ من چۆن دەتوانم بێ ئەم ئەندامە دیارەی لەشم بەسەربەرم .. خۆ پەنجەتووتەی پێم نی‌یە پێڵاوێ لە پێ کەم‌و بیشارمەوە .. من ڕۆژانی پێنج‌شەمموو دەچمە لای خاتو چێختاریۆڤای ژنە ڕاوێژبێ‌کراوی شارستانی .. دەچمە لای پاڵاگیا گریگۆریێفنا پۆدتۆچینای ژنە ئەفسەر . کچێکی ئێجگار شۆخیشی هەیە .. هەروا ناسیاوی باشی‌تریشم هەیە.. ئیتر تۆ خۆت بڕیاربدە ، ئێستا دەبێ حاڵم چۆن بێ ؟ ناتوانم بەم‌شێوەوە لایان دەرکەوم .

فەرمانبەرەکە تاوێك ڕاما . ئەمە بە لێوەکانیدا دیاربوو کە توند توند

نووقاندبوونی • پاشـان گـوتی : نەخەیر ، ناتوانم جاڕنامەیوا لە ڕۆژنامەدا بڵاوبکەمەوە •

ـ بۆ ؟ •• لەبەرچی ••؟

ـ بۆیە • دوور نییە ڕۆژنامەکە بەمـە بەدناو بـێ • هەرکەسێ بێو بنووسێ کەوا لووتی هەڵاتووە •• خەڵـکی دەڵێن ڕۆژنامەکـان کەوتوونەتە بڵاوکردنەوەی درۆو دڵەسەو قسەی پڕوپووچ •

ـ جا بۆ ئەم مەسەلەیە چ پڕوپووچییەکی تێدایە ؟ وابزانم شتیوا لەم مەسەلەیەدا نییە •

ـ تۆ وادەزانی هیچیوای تێدا نییە • هەفتەی ڕابوردوو ڕووداوێـکی لەمچەشنە قەوما • فەرمانبەرێك هەروەك ئێستای تۆ هات جاڕنامەیەکی پێبوو • کرێی بڵاوکردنەوەی دەیکـردە دوو ڕووبڵو حەفتاوسێ کۆپێك • هەمـوو جاڕنامەکەشی بریتیبوو لەوە کە سەگێکی تووكڕەشی ڕای‌کردووە • هیـچ وا دێتە پێش چاو شتێکی ئەوتۆ لەمەدا هەبێ ؟ بەڵام قسەکـەش دەرکـەوت بوختانەو بۆ گاڵتەکردن بە کـابرایەك بڵاوکـراوەتەوە • مەبەست لە سەگـە هەڵاتووەکە ژمێریاری دائیرەیەك بووە ، لەبیرمنەماوە چ دائیرەیەك •

ـ بەڵام من جاڕنامە لەبارەی سەگەوە بڵاوناکـەمەوە ، لەبارەی لووتی خودی خۆمەوە ، وەك بڵێی باسم لە گیانی خۆم دێ •

ـ نەخەیر ، بە هیچ کلۆجێ ناتوانم جاڕنامەیوا بڵاوکەمەوە •

ـ تەنانەت کە لووتم ، لووتی خۆیشم ونبووبێ ؟

ـ ئەگەر لووتت ونبووبێ ، ئەوە مەسەلەکەت لای پزیشکە • دەڵێن

ئێستا پزیشکی‌وا هەیە چ جۆرە لووتێکت بوێ بۆت دەکا ۰ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەست‌دەکەم کەوا تۆ پیاوێکی قسەخۆشی‌و حەزت لێیە لەناو خەڵکدا گاڵتەوگەپ بکەی ۰

ـ سوێندت بۆ دەخۆم بەوخوایە وانی‌یەو بەڕاستمە ۰ فەرموو مادەم وای لێ هات ، پیشانت دەدەم ۰

فەرمانبەرەکە تۆزێ بڕنووتیی کرد بەلووتیەوەو جووڵەجووڵی پێ‌کەوت‌و کەوتە ملەقوتێ‌و گوتی :

ـ ئەگەر نیگەران نابی حەزدەکەم سەیرێکی بکەم ۰

دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران دەستەسڕەکەی لەسەر دەم‌وچاوی لادا ۰ فەرمانبەرەکە گوتی :

ـ خۆ هەر بەڕاستی وایە ۰ شتێکی ئێجگار سەیرە ۰ جێگاکەی بەتەواوی ساف‌و لووسە ۰ دەڵێی شلکێنەیەو هەر ئێستا لە ساج کراوەتەوە ۰ بەڕاستی سەیرە : تەخت‌و ڕێك‌و ڕاست ۰

ـ ئیتر هیچ قسەت دەمێنێ ؟ خۆت بە چاوی خۆت دەبینی دەبێ هەر چاپ‌بکرێ ۰ من بەتایبەتی زۆر مەمنوونت دەبم ۰ زۆریش پێ‌خۆشحاڵم ئەم ڕووداوە ئەوەی بۆ ڕەخساندم کەوا ناسیاویتان لەگەڵ پەیدا بکەم ۰

لەم‌قسەوە دیاربوو کەوا مێجەر نیازی‌وایە ئەم‌جارە هەندێ ڕەوشت‌نزمی بنوێنێ ۰

فەرمانبەر گوتی : بێ‌گومان لەچاپ‌دان کارێکی ئەوەندە زەحمەت نی‌یە ۰ تەنیا ئەوەندە هەیە من هیچ قازانجێکی ئەوتۆی بۆ تۆ تێدا بەدی‌ناکەم ۰ جا

ئەگەر بەڕاستی حەزدەکەی‌و مەبەستتە ، باسەکە بدە بە خاوەن‌قەڵەمێکی ڕەوان تا وەك ڕووداوێکی سەیرو سەمەرە بیکا بە وتارێك‌و بیدە بە ڕۆژنامەی « هەنگی باکوور » [ لێرەدا دیسان بۆنێکی‌تری بە بڕنووتی‌یەکەوە کرد ] بۆئەوەی لاوان سوودی لێ ببینن [ لێرەشدا لووتی سڕی ] یان هەروا بۆئەوەی خەڵکی لێی ئاگادار بن‌و پێ‌یان سەیر بێ •

دەرچووی قوتابخانـەی فەرمانبەران بەیەکجاری نائومێـد بوو • سەری بەسەر داوێنی ڕۆژنامەکەدا شۆڕکردبووەوەو چاوی بڕیبوە نووسینێك لەبارەی شانۆکاری‌یەکانەوە • خەریك بوو زەردەخەنەیەك بـە ناوچاویەوە دیاری‌بدا چونکە ناوی ئەکتەرێکی شۆخی بەرچاو کەوت ، دەستی‌کرد بە گیرفانیا بزانێ بانقەنەوتێکی شینی پێ‌یە ، لەبەرئەوە کە بە بڕوای کۆڤالیۆف مێجەر ئەبێ لە ڕیزی پێشەوە دابنیشێ ، بەڵام بیرکەوتنەوەی لووتی هەمووی لێ‌تێك‌دا •

لەوە دەچوو فەرمانبەرەکە بەم بارە ناڕەحەتەی کۆڤالیۆف دڵگیر بووبێ • وای بە باش زانی ، بۆئەوەی تۆزێ خەم‌و پەژارەی دڵی بڕەوێنێتەوە ، بە چەند وشەیەك بەشداریی خۆی لە هەست‌و غەمیدا دەربڕێ • گوتی :

ـ بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشە ئەم ڕووداوە سەیرە ڕووی لـێ داوی • حەزدەکەی تۆزێ بڕنووتی بکەی بە لووتەوە • بڕنووتی ژانەسەر ناهێڵێ • مەراق لە دڵ دەردەکاو تەنانەت بۆ مایەسیریش باشە •

فەرمانبەر ئەمەی گوت‌و قوتووی بڕنووتی‌یەکەی بۆ کۆڤالیۆف ڕاگرت‌و بە جوانی وێنەی ئەو کیژە شەپقە لەسەرەی خستە بەرچاوی کـە بە دیـوی ناوەیەوە بوو •

ئەم کردارە نابەجێ‌یە کۆڤالیۆڤی پەست‌و تووڕە کرد • لە ناخی دڵەوە

گوتی : من تێناگەم چۆن تۆ نابینیت ئەوەی بۆنی پێ دەکرێ من نیمە ؟ دەك برنووتیت بە قوڕا چێ ! من ناتوانم تەنانەت تەماشاشی بکەم ، نەك هەر ئەو دارکە ڕەشۆکی‌یەی تۆ ، بەڵکو ئەگەر برنووتیی تووتنی « ڕابێ »ی هەرە زۆر چاکی فەرەنسەیش بێ •

ئەمەی گوت و بەوپەڕی زویری و دڵتەنگی‌یەوە ئیدارەی ڕۆژنامەکەی بەجێهێشت و چووە دەرەوە ، بەرەو لای ماڵی سەرۆکی پۆلیسی گەڕەك کەوتەڕێ کە زۆر شەیدای شەکر بوو ، پێشی ماڵەکەی و هەموو مووبەقەکەی کەللە شەکری لێ ڕیزکرابوو کە برادەرانی بازرگانی بۆیان دەهێنا • ئافرەتە چێشتکەرەکەی ماڵیان لەوکاتەدا خەریکی داکەندنی پۆستاڵەکانی پێی قۆمیسەر بوو ، قەمەو گشت تفاقی پۆلیسی‌یەکەی هەر پارچەی لە سووچی تایبەتیی خۆیدا دانرابوو • سدارە سێ سووچە بەسامەکەشی بە دەست کوڕە سێ ساڵانەکەیەوە بوو • ئەو دوای ماندوویی شەڕەشەق و گێرەو کێشەی ژیان ، خۆی ئامادە کردبوو تۆزێ بحەسێتەوەو چەردەیەك خۆشیی ژیان بنۆشێ •

لەکاتێکدا کە سەرۆکی پۆلیس باوێشکی دەداو بە دەنگی بەرز دەیگوت: « ئای ! خوا شوکر ، دوو سەعاتێك بۆ خۆم بە ڕەحەتی دەنوم » ، کۆڤالیۆف خۆی کرد بەژووردا بۆلای • بۆیە دەتوانرێ بەئاسانی بزانرێ ئەم هاتنەی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران بە هیچ کلۆجێك لە کاتی خۆیدا نەبوو • نازانم بڵێم چی ، ئەگەر لەوکاتەدا تەنانەت چەند هۆقە چا یا چەند مەترە فاسۆنیشی بە دیاری بۆ بردبوایە ، هەر باش پێشوازیی لێ نەدەکرد • سەرۆکی پۆلیسی گەڕەك زۆر حەزی لە هەموو چەشنە بەرهەمێکی جوانی هونەرو پیشەسازی بوو ، بەڵام بانقەنوتی دەوڵەتیی لە هەمووشتێ پێ باشتر بوو • عادەتی وابوو هەمیشە دەیگوت و دەیگوتەوە : « ئەمەتە شت ! درۆیە شت لەمە

چاکتر نابێ • خواردنی لێت ناوێ ، جێگە زۆر داگیر ناکا • لە گیرفاندا هەمیشە جێی دەبێتەوە • بشیشکێنیتەوە ناشکێ •

سەرۆکی پۆلیسی گەڕەك زۆر ساردوسڕ پێشوازیی لە کۆڤالیۆف کرد • پێی‌گوت : پاش نیوەڕوان کاتێکی لەبار نی‌یە بۆ لێکۆڵینەوەو بەدوای شتدا گەڕان • سروشت خۆی وای داناوە پاش نان‌خواردنی نیوەڕۆکەمێ حەوانەوە پێویست بێ [ دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران توانی لەمەوە تێ‌بگا کەوا سەرۆکی پۆلیسی گەڕەك لە قسەی نەستەقی پیاوانی بەماریفەتی کۆن بێ‌ئاگا نی‌یە ]و ، پیاوی ماقووڵ لووتی بە بڕین ناچێ‌و ، لە جیهاندا جۆرەها مێجەر هەیە کەوا تەنانەت جلی ناوەوەشیان لەبەردا نی‌یەو سەر بە هەموو شوێنێکی خراپیشدا دەکەن •

قسەکانی سەرۆکی پۆلیسی گەڕەك نەك بە برۆ ، بەڵکو یەکسەر بە ناوچاوی کۆڤالیۆڤدا چەقین • بەئاسانی دەتوانرا هەست بکرێ کەوا کۆڤالیۆڤ کابرایەکی ئێجگار دڵ ناسك بوو ، زوو دڵی دەیەشا • ئەگەر تەنانەت بەرەو ڕووی قسەی نابەجێ بە خۆشی بگوترایە ، دەیتوانی لە هەموو شتێ ببوورێ ، بەڵام بە هیچ کلۆجێك لەوە خۆش نەدەبوو تانەکە پایەو پلەو لەقەبی بگرێتەوە ، بەڵکو ڕای وابوو ئەگەر لە شانۆکاریدا قسەش بە ئەفسەرە بچووکەکان بگوترێ گوێی نەدرێتێ ، بەڵام بە هیچ چەشنێك نابێ باسی ئەفسەرە گەورەکان بکرێ • بۆیە ئەم چاوپێ‌کەوتنەی سەرۆکی پۆلیسی گەڕەك بەجۆرێك شەرمەزاری کرد • سەرێکی ڕاوەشاند • وەك کەسێ کە شانازی بەخۆیەوە بکا باڵی فش‌کردەوەو گوتی : « پێی لێ دەنێم ، پاش ئەم هەموو قسە ناشیرینانەت ناتوانم هیچی‌کەت لەگەڵ بڵێم ••• »

شەکـەتو ماندوو ، گەڕایـەوە بۆماڵەوە . دنیا خەریك بوو تاریـك دادەهات . دوای ئەو هەموو گەڕانو پشکنینە بێ ئەنجامە ، لە دڵتەنگیدا ماڵەکەی خۆی زۆر ناخۆش هاتە پێش چاو . هەر کە خۆی کرد بە ژووردا ، ئیڤـانی خزمەتکاریانی بینی لەسەر قەنەفە چڵکنەکەی ناودالآن لەسـەر گـازی پشت کەوتبوو ، تفی دەگرتە بنمیچەکەو هەموو جارێکیش لە هەمان جێگەی دەدا . ئەو جۆرە کەمتەرخەمی یەی ئەم مرۆڤە ئیمانی لە کەللەی کۆڤالیۆڤدا نەهێشت ، شەپقەکەی کێشا بە ناوچاوانیداو شیراندی بەسەریا : « بەراز ! هەمیشە هەر خەریکی کاری هیچو پووچی » .

ئیڤان لەپڕ لە جێگەی خۆی بەرزەبێ ڕاستبوەوەو بە هەڵەداوان پەلاماری ئاغای دا پاڵتۆکەی لەبەری داماڵی .

مێجەر کە چووە ژوورەکەی خـۆی ، مانـدوو و دڵتەنـگ ، لەسـەر کورسی یەك خۆی دا بە زەویدا . پاش چەند ئاخو ئۆفو هەناسە هەڵکێشانێك گوتی :

ـ خوای گەورە ! خوای گەورە ! ئەم کلۆڵی یە لەپای چی ؟ بهاتایە من قاچێکم یان دەستێکم بقرتایە گەلێ لەمە باشتر بوو . گوێم نەبوایە خراپ بوو ، بەڵام هەر دەمتوانی بەوحاڵەوە بساچێنم . بێ لووت مەگەر خوا خۆی بزانێ چی یە ؟ نە مەلە مەل بێ ، نە بنیادەمە بنیادەم بێ . کەسێکی وا هەر بۆ ئەوە باشە هەڵگیری و لە پەنجەرەوە فڕێی دەیتە خوارەوە . تەنانەت ئەگەر لە جەنگیشدا لووتم ببڕایە یان لە شەڕەشیردا بپەڕی یایە خەتای خۆم بوایە وا لووتم نەماوە ، بە هەر ڕەنگ . بەڵام لەپێناوی شتێکدا لێم ونەبوە . لە خۆڕایی و هـەر لەخۆیەوە نەماوە . ئەمە هەر ناشێو ناکرێ ! ئەمەی لە دڵی خۆیدا گـوتو بەدەم بیرکردنەوەوە لەسەر قسەکانی لە دڵی خۆیدا ڕۆیی . نە ، نەخێـر ،

نابێ ، ڕاست نیی‌یە • زەحمەتە لووت ون‌ببێ • زۆر دوورە • بە هیچ جۆرێك لەوانە نیی‌یە وابێ • ڕەنگ‌بێ خەو بێ یا هەر بە خەیاڵ وابزانم • دوور نیی‌یە بە ڕێکەوت بەهەڵە لەجیاتیی ئاو ڤۆدکام خواردبێتەوە ، ئەوەی پاش ڕیش‌تاشین لە دەمو چاومی دەدەم • ئیڤانی کەر نەیخواردوەتەوە ، خۆم فتم‌کردووە •

مێجەر بۆئەوەی بەڕاستی بزانێ سەرخۆش نیی‌یە ، بەقایم نقورچێکی لە خۆی گرت ، بەجۆرێ لەتاو ئازار قیژاندی • ئەم ئازارە بەتەواوی گومـانی ڕەواندەوەو تێی‌گەیاند کەوا سەرخۆش نیی‌یـە • هێدی هێدی لە ئاوێنەکـە نزیك‌بووەوەو لەپێشدا چرچاوی گرژکرد بەڵکو ئەمـە خوایـە لووتەکـەی لەجێیی‌خۆیەوە سەرهەڵدا ، بەڵام هەر دەس‌بەجێ بەپەلە پاشەوپاش گـەڕایەوەو گـوتی :

ـ ئای کە شێوەیەکی ناحەزە !

ڕاستەکەی ئەمە شتێکی وانەبوو سەری لێ دەرچێ • قۆپچەیەك بکەوێ یان کەوچکێکی زیو یان سەعاتێك یان هەر شتێکی‌تری لەمچەشنە ون‌ببێ ، هیچ عاجباتی نیی‌یە • بەڵام لووت ون‌ببێ‌و ، لووتی کێ‌یش ؟ هیی مێجەر کۆڤالیۆف‌و ، لەکوێیش ؟ لە ماڵی تایبەتیی خودی خۆیدا ، ئەمـە هەر بەجـارێ سـەیرەو سەمەرە ! مێجەر کۆڤالیۆف هەموو بیری خۆی بەتەواوی خستبوە کارو هەموو سەرێکی مەسەلەکەی لێك‌دابووەوەو گـەیشتبوە شتێ کە لە هەر شتێکی‌تـر لە ڕاستی‌یەوە نزیکتر بێ • شتەکەش ئەوەبوو کە ئەبێ خەتاباری ئەم کارە خاتوو پۆدتۆچینای ژنە ئەفسەر بێ کەوا حەزی‌دەکرد کۆڤالیۆڤ کچەکەی بخوازێ‌و ئەمیش حەزی لێ‌بوو دڵداریی لەگـەڵ بکاو لەگەڵی ڕابوێرێ ، بەڵام دەترسا مەسەلەکە بەیەکجاری ببڕێتەوە • کاتێکیش خاتوو پۆدتۆچینا ڕاستەو ڕاست پێی‌ڕاگەیاند کە ئارەزوو دەکات کچەکەیی لێ مـارە ببـڕێ ، ئـەو بەدەم

تاریف‌کردن‌و به شان‌و باڵدا هەڵدانی کچەکەوە کشایەوەو گوتی : من هێشتا لاوم‌و پێویستە پێنج ساڵێك خزمەت بکەم ، تەمەنم بێ بە چل‌و دوو ساڵی خشت . جا بۆیە خاتوو پۆدتۆچینای ژنە ئەفسەر بۆئەوەی تۆڵەی لێ بسێنێتەوە بڕیاری داوە کەتێکی پێ بکا ناشیرینی بکا ، هاتوە هەندێ پیرێژنی جادووگەری بەکرێ گرتووە ، ئەگینا بە هیچ چەشنێك بە خەیاڵی کەسدا نایەت لووت بقرتێ . خۆ کەس نەهاتوەتە ژوورەکەی بۆ لای‌و ، ئیڤان یاکۆڤلێڤیچی سەرتاشیش ڕۆژی چوارشەممەوو ڕیشی بۆ چاك‌کردو بەدرێژایی ئەو ڕۆژەو تەنانەت ڕۆژی پێنج‌شەممەویش لووتی ساغ‌و سەلیم بوو . کۆڤالیۆف ئەمەی باش لەبیربوو و باشی ئاگا لێ بوو . زیاد لەوە هەستی بە هیچ ئازارێکیش نەکردووەو بێ‌گومان ئەگەر برینداریش بوایە وا زوو چاك نەدەبووەوەو وا خێرا شوێنەکەی وەك شلکێنە پان‌و ساف‌و لووس هەڵنەدەگەڕا . لە مێشکی خۆیدا کەوتە پلان‌دانان‌و لێکی‌دایەوە ئاخۆ خاتوو پۆدتۆچینای ژنە ئەفسەر بە ڕەسمی ڕاکێشێ بۆ دادگا یاخود باشتر وایە خۆی بچێتەماڵەوە بۆ لای‌و قسەی لەگەڵ بکا ؟ لەوکاتەدا ڕووناکی‌یەك لە درزەکانی دەرگاکەوە شەوقی دایە ژوورەوەو ئەوەی پێ‌ڕاگەیاند کە ئیڤان لە دالانی ماڵەکەدا مۆمی داگیرساند . ئەو ڕووناکی‌یە لێکدانەوەکەی پێ بڕی‌و زۆری نەبرد ئیڤان خۆشی پەیدابوو و مۆمەکەی هێناو ژوورەکەی هەموو ڕووناك کردەوە . یەکەم جووڵەی کۆڤالیۆف ئەوەبوو پەلاماری دەستەسرەکەی داو ئەو شوێنەی پێ داپۆشی کە تا دوێنێ هێشتا لووتی پێوەبوو ، بۆئەوەی خزمەتکاری نەفام بەو سەیرو سەمەرەیی‌یەوە ئاغای نەبینێ .

ئیڤان فریا نەکەوت بچێتەوە کولانەکەی خۆی کە لە دالانەکەوە دەنگی کابرایەکی نەناسیاوی کەوتە بەرگوێ ، دەیپرسی :

ـ كۆڤالیۆڤی دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران لێرە دەژی ؟

کۆڤالیۆڤ بەخێرایی ڕاپەڕی ، دەرگاکەی کردوەو گوتی : وەرە ژوورەوە • مێجەر کۆڤالیۆڤ لێرەیە •

فەرمانبەرێکی پۆلیس هاتە ژوورەوە • کابرایەکی قۆز بوو • لاجانگەکانی درێژ ، نە زۆر کاڵو نە زۆر تۆخ بوون • ڕوومەتەکانی ئێجگار قەڵەوو خڕ بوون • هەمان کابرا بوو کە لە سەرەتای چیرۆکەکەوە لەوسەری پردی ئیساکییێفسکی وەستابوو •

ـ ڕێم بدەن لێتان بپرسم جەنابتان لووتی خۆتانتان ون کردووە ؟

بەڵێ ، وایە •

ـ هەر ئێستا دۆزرایەوە •

مێجەر کۆڤالیۆڤ لە خۆشی‌یان قیژاندی : ئەوە تۆ دەڵێی چی ؟ لە خۆشی‌یاندا زمانی شکا • بە هەردوو چاوی زەق دەیڕوانی‌یە کابرای پۆلیس کە لە بەردەمیدا ڕاوەستابوو و شەپۆلی شەوقی مۆمەکە بەسەر لێوە ئەستوورو کوپە خڕنەکانیەوە ئەلەری‌یەوە •

ـ چۆن ؟ چۆنتان دۆزی‌یەوە ؟

ـ بە ڕێکەوتێکی سەیر ! لەسەر چەقی ڕێگادا گرتمان • لەناو واگۆنێکی گەورەی ڕێبواراندا دانیشتبوو • دەیویست بچێ بۆ شاری ڕیگا • پاساپۆرتەکەی بە ناوی فەرمانبەرێکەوە بوو ، دەمێ بوو دەرهێنرابوو • سەیر ئەوەیە لە سەرەتادا تەنانەت من خۆشم بە ئاغایەکی گەورەی تێگەیشتم ، بەڵام بەخت هێنای ، چاویلکەکەم پێ بوو • دەس بەجێ بینیم لووت خۆیەتی • ئاخر من

چاوم کزەو ئەگەر جەنابت لە بەردەممدا بوەستی تەنیا دەمو چاوت دەبینمو لووتتو ڕیشت هیچ بەدی ناکەم • خەسووشم ، واتە دایکی ژنەکەم ، هەروەها هیچ نابینێ •

کۆڤالیۆڤ لەخۆشییاندا ئاگای لە هیچ نەمابوو • هاواریکرد :

ـ کوا ؟ لەکوێیە ؟ هەر ئێستا بە ڕاکردن ئەچم •••

ـ خەمت نەبێ •• دەمزانی پێویستت پێیەتی ، بۆیە لەگەڵ خۆم هێناومە • زۆر سەیرە کە بەشداری سەرەکیی ئەم مەسەلەیە ئەو سەرتاشە ساختەچییەیە کە ئێستا لە شەقامی ڤۆزنێسێنسکی لە ژووری گرتەخانەدایە • من لەمێژبوو گومانی سەرخۆشیو جەردەییم لێ دەکرد • سەرەڕای ئەوەش سێ ڕۆژ لەسەریەك هەموو ڕۆژێ ڕزێ قۆپچەی لە دووکانێك دزی • لووتەکەتان پێشان چۆن بووە هەروا ماوە •

کابرای پۆلیس ئەمەی گوتو دەستیکرد بە گیرفانیدا لووتەی لێ دەرهێنا ، پێچرابوو لە پارچەیەك کاغەزەوە •

کۆڤالیۆڤ هاواریکرد : خۆ ئەوە خۆیەتی ! ڕەپو ڕاست خۆیەتی ! ئەنجا ڕوویکردە پۆلیسەکەو پێیگوت : دەبێ ئەمڕۆ پیاڵەیەك چام لەگەڵ بخۆیتەوە •

ـ بە شانازییەکی گەورەی دەزانم بۆ خۆم ، بەڵام بە هیچ کلۆجێ بۆم ناکرێ • دەبێ لێرەوە بچم سەرێ لە ماڵە پڕ لە حەجو لوورەکەم بدەم • گرانی هەموو جۆرە کەلوپەلو خواردەمەنییەکی گرتووەتەوە • لە ماڵەوە ، من ، خەسووم ، واتە دایکی ژنەکەمو ، چەند سەر منداڵ بەخێو دەکەم • کوڕە

گەورەکەم زۆر زیرەکەو هیوای گەورەی لێ دەکرێ ، بەڵام دەستم کورتەو بۆ پەروەردەکردنو پێگەیاندنی هیچ شك‌نابەم •

کۆڤالیۆف حاڵی بوو کابرای پۆلیس مەبەستی چی‌یە•دەستی‌برد بانقەنەوتێکی سووری لەسەر مێزەکە هەڵگرتو خستیە ناو دەستی • پۆلیسەکە بۆی چەمی‌یەوەو ڕێزو سوپاسێکی زۆری پێشکەش کردو ماڵاوایی لێ کردو چووە دەرەوە • هەر ئەو دەقیقەیە دەنگێ لە شەقامەکەوە بەر گوێی کۆڤالیۆف کەوت ، پۆلیسەکە بوو شەقازللەیەکی لە ناودەمی کابرایەکی نەفام سرەواند کە بە عەرەبانەکەیەوە چووبووە ناو باخچەیەکی قەراغ شەقامەوە •

دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران دوای ڕۆیشتنی پۆلیسەکە چەند دەقیقەیەك وڕ بوو • ئەو خۆشی‌یە چاوەڕوان نەکراوە وا وڕی کردبوو • پاشان وردە وردە هاتەوە هۆشی خۆیو کەوتە ئەوەی هەست بە شت بکاو شت ببینێ • دەستی‌برد بەئاستەم لووتە دۆزراوەوەکەی هەڵگرتو لەسەر هەردوو لەپی دەستی داینا‌و جارێکی‌تر بە وردی تێی‌ڕوانی‌و گوتی :

ـ خۆیەتی • ڕاستو ڕەوان ئەوە • ئەوەش زیپکەکەیە بە لای چەپیەوە کە دوێنێ لێی دەرهاتبوو •

مێجەر ، تۆزێکی مابوو لە خۆشی‌یاندا بداتە هاڕەی پێکەنین •

بەڵام شت نی‌یە لەم جیهانەدا زۆر بخایەنێ • بۆیە لە دەقیقەی دووهەمدا خۆشی‌یەکەی وەك خۆشیی دەقیقەی یەکەم نەما • لە دەقیقەی سێهەمدا لاوازتر بوو • لەکۆتاییشدا بێ‌ئەوەی هەستی پێ بکرێ تێکەڵ بە گیانی عادەتیی بوو ، وەك چۆن بڵقی سەرئاو کە پاش تێ‌فڕێ‌دانی بەردێ پەیدادەبێ سەرەنجام لەناو ئاوەکەدا دەڕەوێتەوە • کۆڤالیۆف کەوتە لێکدانەوەو دەرکی کرد

کەوا هێشتا مەسەلەکە نەبڕاوەتەوە • بەڵێ ، لووتە دۆزراوەتەوە ، بـەڵام خۆ پێویستە بخرێتەوە جێی خۆیو پێیەوە جێگیر بکرێتەوە •

ـ ئەی ئەگەر نەگیرسایەوە پێیەوە ؟

ـ مێجەر کە ئەم پرسیارەی لە خۆی کرد ، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا •

بەهەستێکی پڕترسەوە بەهەڵەداوان بەرەو لای مێزەکە چوو • ئاوێنەکەی نزیك خستەوە ، نەوەکوو لووتەکەی لە جێی خۆی خوار دانێ • دەستەکانی دەلەرزین • لەسەرخۆ بە وردی لەسەر جێکەی زووی خۆیی دانـا • ئـۆی لەو نەگبەتی‌یە ! لووت بە جێی خۆیەوە نەنووسایەوە • بردی بۆ لای دەمی ، بە هالاوی هەناسەی خۆی کەمێ گەرمی کردەوەو سەرلەنوێ بەرەو شوێنـە تەختو سافو لووسەکەی نێوان هەردوو ڕوومەتی برد ، بەلام دیسانەوە لووتە بە هیچ جۆرێك پێوەی بەند نەبوو •

بە لووتەی گوت : دەی ، دە یاڵلا ، دەی ، نەفام بجۆرەوە جێگەکـەی خۆت •• بەلام لووتە هەر دەتگوت پارچە دارێکی ڕەقو تەقە ، دەکەوتە سەر مێزەکەو دەنگێکی‌وا سەیری لێوە دەهات دەتگوت تەپەدۆرە • مێجەر بەتەواوی شڵەژاو ڕەنگی هەڵبزڕکاو بەترسەوە گوتی : تۆ بڵێی جێی خۆی نەگرێتـەوە ؟ چەند جار لەسەر شوێنی تایبەتیی خۆی دایدەنا ، بەلام هەموو جارێ هەوڵەکەی بێ‌ئەنجام دەبوو •

هاواری ئیڤانی کردو ناردی بەدوای پزیشکدا کە لە ڕیزی ماڵی ئەواندا لە خانوویەکی باشو جواندا دەژیا • پزیشکەکە پیاوێکی بەسام بوو • جووتێ لاجانگی زەردباوی ڕێكو پێکی پێوەبوو • ژنێـکی تەندروستی باشی هەبوو • سبەینان کە لە خەو هەڵدەستا هەندێ‌سێوی تازەی دەخوارد • دەمو ددانی لە

سنوور بەدەر پاك ڕادەگرت • هەموو بەیانییەك نزیكەی سێ‌چارەك سەعات ئاوی لە دەمی وەردەداو بە پێنج جۆر فڵچە ددانەكانی دەشت • پزیشكەكە هەر ئەو دەقیقەیە هات • پاش‌ئەوەی لێی‌پرسی : دەمێكە ئەو نەگبەتی‌یەی بەسەردا هاتووە ، یەكسەر چەناگەی مێجەر كۆڤالیۆڤی گرت‌و هەڵیساندە سەر پێ‌و وا قایم پەنجە گەورەی بەو شوێنەدا نا كە پێشان لووتی پێوە بوو ، مێجەر لەتاوان ناچاربوو هێندە بەهێز سەری بەدوادا بشكێنێتەوە ، پشتی سەری دای بە دیوارەكەدا • پزیشكەكە گوتی : ئەمە وەنەبێ شتێكی ئەوتۆ بێ‌و ئامۆژگاریی كرد كەمێك لە دیوارەكە دووركەوێتەوەو داوای لێ كرد لەپێشدا سەری بە لای ڕاستدا لاربكاتەوەو ئەنجا پەنجەی هێنا بەو شوێنەدا كە جاران لووتی پێوە بوو و « هم »ێكی بۆ كرد • جا داوای لێ كرد سەری بە لای چەپیشدا بخاو « هم »ێكی‌تریشی بۆ كردو ، لەكۆتاییشدا ، دیسان وا توند پەنجە گەورەی بە شوێنی لووتیدا نا ، مێجەر كۆڤالیۆڤ وەك ئەسپی بەلەسەبووی لێ هات چۆن كە تەماشای ددانەكانی بكرێ هەر سەری بەم‌لاو بەولادا ڕادەتەكێنێ • پزیشك كە لەم تاقی‌كردنەوەیە بوەوە ، سەرێكی ڕاوەشاندو گوتی :

ـ نەخێر ، نابێ • هەر وا باشترە بەم شێوەیەی ئێستات بمێنیتەوە ، ئەگینا دوور نی‌یە شتێكی خراپتر ڕووبدات • من دەمتوانی هەر ئێستا بۆت بخەمەوە شوێنی خۆی ، بەڵام دڵنیات دەكەم كە ئەمە زیانی زۆرترە بۆت •

كۆڤالیۆڤ گوتی : سەیرە ! ئەی من چۆن بێ لووت هەڵدەكەم ؟ بڕوا ناكەم لەمەی ئێستا خراپتر بێ • مەگەر شەیتان بە شەیتانیی خۆی بزانێ ئەمە چی‌یە ! من چۆن بەم‌شێوە ناحەزەوە خۆم پیشانی خەڵك بدەم ؟ من دۆست‌و ناسیاوی چاكم زۆرە • تەنانەت ئەمڕۆ لە دوو ماڵ بانگ‌كراوم بۆ سەر ئاهەنگ • من لەگەڵ زۆر كەس ئاشنایەتیم هەیە ، وەك خاتوو چێختاریۆڤای ژنە

ڕاوێژپێکراوی شارستانیو خاتوو پۆدتۆچینای ژنە باش ئەفسەر •• هەرچەندە لە سایەی خواوە پاش ئەم تاوانەی پێوەندم لەگەڵی نەماوەو تەنیا لە ڕێگای پۆلیسەوە لەگەڵی دەدوێم •• ئەنجا بە دەنگێکی پڕ لالآنەوەو پاڕانەوەوە گوتی : پیاوەتیت هەبێ دوکتۆر ، ئەم چاکەیەم لەگەڵ بکە • تۆبڵێی چارێك نەبێ . هەرچۆنێك بوە بۆم پێوە بنێرەوە ، با زۆر باشیش نەبێ ، هەر ئەوەندە بیگرێ ، تەنانەت لە حاڵەتی مەترسیشدا دەتوانم بە هێواشی دەستی بدەمەبەر • لەمەولا دانس‌ناکەم نەوەك لە جووڵەیێکی توندا شتێکی لێ بێت • هەرچی لەبارەی کرێی هاتن‌و ماندوو بوونیشتانەوەیە ، ئەوە دڵنیا بن هەرچیم هەیە لەم‌پێناوەدا دایدەنێم‌و بەزیادەوە وەری‌دەگرن •

پزیشکەکە بە دەنگێکی نە بەرزو نە نزم ، بەڵام ئێجگار دڵگیرو ناسکەوە گوتی : بڕوات بێ من هەرگیز بۆ تەماع تیماری نەخۆش ناکەم • پارەپەرستی لە ژیان‌و کاری خۆمدا بە شتێکی چەپەڵ دەزانم • بەڵێ ، هەقی هاتن‌و فەحس وەردەگرم ، بەڵام هەر بۆئەوەی نەخۆش دڵی لێم نەیەشێ‌و لێم زویر نەبێ • بێ‌گومان دەمتوانی لووتت بلکێنمەوە بە جێی خۆیەوە ، بەڵام ئەگەر بڕوا بە قسەم ناکەی ئەوا بە شەرەفی خۆم سوێندت بۆ دەخۆم کە جێگیرکردنەوەی زۆر لە باری ئێستای خراپتر دەبێ • بە قسەی من بکە • زوو زوو بە ئاوی سارد بیشۆو بڕوات بێ بێ‌لووتیش تەندروستیت هەروا تەواو دەبێ ، وەك چۆن ئەگەر لووتیشت هەبوایە • هەرچی لووتەکەشتە ، ئەوا من ئامۆژگاریت دەکەم بیخەرە قاپێکی شووشەی پڕ لە ئیسپرتۆوەو زۆر باشیشە ئەگەر دوو کەوچکە چێشت ڤۆدکای تیژو کەمێ سرکەی گەرم‌کراوەشی بکەی بەسەردا • ئەوسا دەتوانی بە پارەیەکی باش بیفرۆشی • تەنانەت ئەگەر زۆر گران داوا نەکەی خۆیشم ئامادەم لێت بکڕم •

مێجەر کۆڤالیۆڤ بە دڵشکاوی‌یەکەوە گوتی : نەخەیر ، نەخەیر ! بە هیچ نرخێك نایفرۆشم ! لەناوبچێ لەوە چاکترە •

پزیشکەکە دانەوی‌یەوەو گوتی : لێم ببوورە ! من ویستم قازانجت پێ بگەیەنم •• چار چی‌یە ؟ تۆ بە چاوی خۆت بینیت چەند خۆمم پێوە ماندوو کردی • ئەمەی گوت‌و بە ویقارو نەزاکەتێکەوە چووە دەرەوە • کۆڤالیۆڤ لەبەر خەستیی خەم‌و سەرلێ‌شێواوی تەنانەت شێوەی دەم‌وچاوی پزیشکەکەشی بەدی‌نەکرد ، تەنیا سەرقۆڵە خاوێنە وەك بەفر سپی‌یەکانی کراسەکەیی بینی لە قۆڵی ڕەشی چاکەتەکەیەوە هاتبوونەدەر •

ڕۆژی دوایی بڕیاری‌دا بەرلەوەی شکات لە خاتوو پۆدتۆچینای ژنە باش ئەفسەر بکات ، نامەیەکی بۆ بنووسێ‌و بزانێ ئاخۆ ڕازی‌دەبێ بێ‌هەرا هەراو پەنابردنە بەر دادگا ئەوەی پێویستە بۆی بگەڕێنێتەوە • بابەتی نامەکە بەم‌شێوەیە بوو :

خانمی بەڕێز ،

ئەلێکساندرا گریگۆریێڤنا !

هەرچەند دەکەم‌و دەکۆشم لە کاری سەیری جەنابت سەردەرناکەم • دڵنیابە کەوا تۆ بەو خراپەکاری‌یەت لەگەڵ من ، هیچ‌نابەیتەوەو ، تۆسقاڵێك ناچارم ناکەی کچەکەت بخوازم • بڕوا بکە ئەو ڕووداوەی لە لووتم قەوماوە هەمووییم بەتەواوی لێ ئاشکرایەو چاك دەزانم لەم کارەدا سەبەبکاری سەرەکی هەر تۆی‌و لە تۆ بەولاوە کەسی‌تر نی‌یە • لە جێی خۆ هەڵکەنرانی لەپڕی لووتم‌و خۆگۆڕینی جارێك لە شێوەی فەرمانبەرێك‌و ، دواجار لە شێوەی عادەتیی خۆیدا ، دیارە لەوە بەدەر نی‌یە کە

لەئەنجامی سیحرو جادوویەکەوە بێ یا خۆت لێت کردبم یا ئەوانەی لەم کارە پیرۆزەدا لەگەڵت خەریکن ٠ من بەش بەحاڵی خۆم بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دادەنێم لەوە ئاگادارت کەم کەوا ئەگەر ئەو لووتەی ناوم هێنا ، هەر ئەمڕۆ بە جێی خۆیەوە نەگیرسێتەوە ، ئەوا من ناچاری داکۆکی کردن لە خۆم دەبم و پەنا دەبەمە بەر قانوون پارێزگاریم لێ بکا ٠

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزو سڵاوم ٠

بەندەی گوێڕایەڵتان :

پلاتۆن کۆفالیۆف

جەنابی بەڕێز

پلاتۆن کووزمیچ !

نامەکەت ئێجگار سەرسامی کردم ٠ بێپێچ وپەنا پێ لەوە دەنێم کە بە هیچ جۆرێ چاوەڕوانیی ئەوەم لێ نەدەکردی لە ناهەق هێندە بێئینسافانە سەرزەنشتم بکەی ٠ من ئاگادارت دەکەم کەوا ئەو فەرمانبەرەی تۆ ناوت هێناوە نە بە خۆگۆڕیوی و نە بە شێوەی تەبیعیی ، هەرگیز لە ماڵی مندا میوانداریی نەکراوە ٠ بەڵێ ڕاستە فیلیپ ئیڤانۆڤیچ پۆتانچیکۆڤ هاتووەتە ماڵم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کە ڕاست و ڕەواز خوازبێنیی کچەکەمی لێ کردم و ، هەرچەند کابرایەکی ڕەوشت باش و زانایەکی مەزنیشە ، گڤتم نەدایەو هیچ هیوایەکم نەخستە دڵی ٠ تۆ ناوی لووتیشت هێناوە ٠ ئەگەر مەبەستت ئەوەبێ ویستبێتم لووتت بشکێنم ، واتە کچەکەمت نەدەمێ ، ئەوە بەلامەوە سەیرە شتیوا بڵێی ، چونکە وەك خۆت دەزانی بەپێچەوانەوە من ڕایەکی کەم بووەو هەمیشە لایەنگیری ئەوە بووم بیتە

هاوسەری کچەکەم • ئەگەر ئێستاش بە شێوەیەکی قانوونی کچەکـەم مـارە بکەی ، من هەر ئێستا ئامادەم بڵێم باشەو ڕەزامەندو دڵنیات بکەم ، چونکە ئەمە هەمیشە ئەوپەڕی ئاوات‌و ئارەزووی هەرە بەکوڵ‌و بەجۆشی ژیانم بووەو ، هەر بەوهیوایشەوە هەمیشە ئامادەی بەجێ‌هێنانی هەر فەرموودەیەکی جەنابتانم •

ئەلێکساندرا پۆدتۆچینا

کۆڤالیۆڤ کە وەڵامەکەی پۆدتۆچینای خوێندەوە ، گوتی : نەخـەیر ! بێ‌گومان ئەو هیچ تاوانی نی‌یە • بڕواناکەم هیچ گوناهێکی هەبێ ! کـەسێ تاوانی ئەم گوناهەی کردبێ هەرگیز نامەی‌وا ماقووڵانـەی پێ نانووسـرێ • دەرچووی قوتابخانەی فەرمانبەران خۆی زۆر چاك ئەمەی دەزانی ، چونکە کە لە ناوچەی قەوقاز بوو گەلێ‌جار نێررابوو بـەم‌لاو بـەولادا بۆ کۆڵینـــەوە • سەرەنجام دەستەکانی بەردایەوەو لەبەرخۆیەوە گوتی : ئەمە چۆن ڕووی‌دا ؟ بە بڕیاری کێ ئەم سەرگوزەشتەیە قەوما ؟ مەگەر تەنیا شەیتان ســەری لەمــە دەربچێ !

لەم‌ماوەیەدا دەنگوباسی ئەم ڕووداوە سەیرو سەمەرەیە بە هەموولایەکی پایتەختدا بڵاوبووەوەو ، وەك باویشە گەلێکیشی خرایە سەر • ئەو سەردەمە بیرو خەیاڵی خەڵك هەموو لای شتی سەمەرەو ناعادەتی بوو • هەر ماوەیەکی کەم لەوەپێش خوویان دابوە تاقی‌کردنەوەی نواندنی میگناتیزی • باسی سیحرو جادووی هەڵپەڕینی کورسییش لە شەقامی کۆنیووشێنایا هێشتا هەر نوێ بوو ! بۆیە هیچ سەیر نـەبوو خـەڵك بڵێن گـوایە لووتی کۆڤالیۆڤی دەرچـووی قوتابخانەی فەرمانبەران سەعات سێی ڕێك بە شەقامی نێڤسکیدا پیاسە دەکـاو ، هەموو ڕۆژێ خەڵکێکی زۆری بێ‌ئیش‌وکار بۆ سەیرکردن خڕبنەوە • هەر

ئەوەندە یەکێ گوتبوویایە لووتە لە کۆگـای ( یوونکێـر )ە ، ئیتـر دەسبەجێ قەرەباڵغیو پاڵەپەستۆیەك لە دەوروبەری ئـەو کۆگایـە پەیدا بووبوو ناچـار پۆلیس هاتبوو بڵاوەیان پێ بکا • کابرایەکی قۆرخکاری سەرو سیما ماقووڵو لاجانگ پانو درێژیش کە لە بەردەرگای شانۆکەی تەنیشت ئەو کۆگایـەوە کێكو چۆرەكو شتیوای دەفرۆشت ، هەندێ قەنەفەی دار حەیزەرانی جوانی لای خۆیەوە ڕیزکرد ، بە هەشتا کۆپێك ڕێی ئەوانەی دەدا کە تینووی دیتنی لووتە بوون ، لەسەریان دانیشن • کۆلۆنێلێکی پایەبڵندی سوپایش سبەینێ زوو لە ماڵ چووە دەرەوە بۆ دیتنی ئەو بەزمەو بە هەزار مەینەتو دەردیسـەری توانی دڕ بە قەرەباڵغییەکە بداو بچێتە پێشەوە ، بەڵام لە بەختی ڕەشی ئـەودا لە پەنجەرەی کۆگاکەوە لەباتیی لووتە بلووزێکی خوریو وێنەی کچێـکی بەرچاو کەوت گۆرەوییەکـەی هەڵدەکێشا • کوڕێـکی هەرزەکاریش بـە بە ڕێشێکی تەنكو یەخەیەکی والاوە لەبنەوە چاوی بڕیبوە کچەکە •• ئـەو وێنەیە دە ساڵ پتر بوو بەو شوێنەوە هەڵواسرابوو • کۆلۆنێلەکە بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوەو بە تووڕەییەوە گوتی : « چۆن دەبێ ئەم خەڵکە بەمجۆرە بـەم قسەی قۆڕو درۆو دەلەسە بێماناو ناڕاستانە بووروژێنرێن ؟ » •

دوایی دەنگ بڵاو بوودوە کـەوا لووتی مێجەر کۆڤالیۆف لە شـەقامی نێفسکی نا ، بەڵکو لە باخی تاڤریچێسکی پیاسە دەکاو لەمێـژە هەمـوو ڕۆژ دەچێ بۆ ئەوێو ، کاتێ کە خوسرەو میرزا هێشتا لەوێ دەژیـا ، زۆر بـەم یارییە سەیرەی سروشت سەرسام بـووە • هەندێ لە قوتابییانی ئەکادێمیی نەشتەرکاریش چوون بۆ ئەوێ بۆ سەیر • ئافرەتێـکی ناودارو ئاغریش بـە نامەیەکی تایبەتی داوای لە چاودێریکەرانی باخەکە کرد کە ئەو گیانلەبەرە سەیرە پیشانی منداڵەکانی بـداو ، ئەگـەر دەشکرێ پەنـدو ئامۆژگاریو

لێکدانەوەشی لەگەڵ بێ بۆیان •

هەموو ئەوانەی لە ئاهەنگەکانی گەورەماڵاندا بەشدار دەبوون‌و حەزیان لە خستنە پێکەنینی ژنان‌و نوکتە بۆ گێڕانەوەیان هەبوو ، بەم ڕووداوانە ئێجگار زۆر کەیف‌خۆش بوون ، چونکە بازاڕی نوکتە لەوڕۆژانەدا کز بوو و نوکتە بەدەستەوە نەمابوو دەماودەمی بکەن • بەشێکی کەمیش لە کەسانی ماقووڵ‌و نیازپاك ئێجگار ناڕەحەت بوون • گەورەپیاوێك بە دڵێکی ناڕەحەتەوە دەیگوت : من تێناگەم چۆن لەم سەدەی زانست‌و بیری ڕوونەی ئێستادا درۆو دەلەسەی بێ‌مانای‌وا بڵاودەبێتەوەو ، سەرسامم بەوەی چۆن دەوڵەت گوێ بەمە نادات ؟ ئەو گەورەپیاوە وەك دیار بوو لەوجۆرە گەورەپیاوانە بوو حەزیان دەکرد دەوڵەت خۆی لە هەموو شتێ هەڵقورتێنێ ، تەنانەت لە کێشەی ڕۆژانەشیان لەگەڵ ژنەکانیان • پاش ئەمە ، ئیتر لێرەوە دیسانەوە سەرلەنوێ مەسەلەکە تەم‌ومژ دایدەگرێتەوەو ، دوایی چی دەقەومێ‌و چۆن دەبێ ، بەتەواوەتی ئاشکرا نی‌یە ••

**- ٣ -**

زۆر شتی هیچ‌وپووچ لە دنیادا ڕوودەدا • جاری‌وا هەیە شتی ئەوتۆ دەقەومێ بە هیچ کلۆجێ لە ڕاستی‌یەوە نزیک نی‌یە • بۆنموونە ئەوەبوو لووتە کە خۆی کردبوو بە ڕاوێژبێ‌کراوی شارستانی‌و شوێنی خۆی جێ‌هێشتبوو و بە شاردا دەهات‌و دەچوو و خەڵکێکی زۆری وروووژاندبوو ، لەپڕ وەك هیچ ڕووی‌نەدابێ سەرلەنوێ چووەوە جێی خۆی‌و لە شوێنی خۆیدا لەنێوان هەردوو ڕوومەتی مێجەر کۆڤالیۆفدا سەری هەڵدایەوە • ئەمە لە حەوتی نیساندا ڕووی‌دا • ئەوەبوو کۆڤالیۆف سبەینێی ئەو ڕۆژە لە خەو

خەبەری بوەوەو بە ڕێکەوت تەماشای ئاوێنەی کـرد ، بینـی لووتی لە جێـی خۆیدایە · دەستی بۆ برد ، دەبینێ ڕاستە لووتیەتی ! « ئەها ! »یەکی بۆ کرد. لە خۆشی یان تۆزێکی مابوو بە پێی پەتی دەستکا بە هەڵپەڕینو هەڵخستنەوە · بەڵام خۆ بە ژووردا کردنی ئیڤان لێی تێکدا · فەرمووی خێرا مەسینەو لەگەنی بۆ بێنن دەمو چاوی بشـوا · دەمو چاوی شتو جارێکی تر تەماشای ئاوێنـەی کرد : ئەمجاریش لووتەی بینی ! دەمو چاوی بە خاولی سڕیو سەیرێکی تری ئاوێنەکەی کردو دیسانەوە چاوی بە لووتە کەوتەوە ·

ـ ئیڤان ! سەیرکە · وابزانم زیپکەیـەك لەسـەر لووتم دەرهاتووە · کۆڤالیۆڤ ئەمەی گوتو بیری کردەوە : « نەگبەتی ئەوەیە ئێستا ئیڤـان بڵێ گەورەم نەك هەر زیپکەی لێ نەهاتووە ، بەڵکو لووتت هەر پێوە نییە » · بەڵام ئیڤان گوتی :

ـ هیچ ·· هیچ جـۆرە زیپکەیـەکی لێ دەرنەهاتووە · لووتت پـاكو بێ گەردە ·

ـ لێدە ·· تاڵانی شەیتانت لێدا ! مێجەر ئەمەی بە خۆی گوتو پلێـکی تەقاند · ئا لەوکاتەدا ئیڤان یاکۆڤلێڤیچی سەرتاش لە دەرگاکـەوە سـەیرێکی کرد ، بەڵام بەترسەوە وەك پشیلەیەك کە هەر ئێستا لەسەر ڕفاندنی پارچـە گۆشتێك تێروپڕیان کوتابێ ·

کۆڤالیۆڤ هەر لە دوورەوە هاواری لێ کرد : پێشەکی بڵێ ·· دەستت پاکـە ؟ ·

ـ پاکە ·

ـ درۆ دەکەی !

– گەورەم ! بە خوا قەسەم ، پاکە •

– باشە ، بەڵام ، ها ، ئاگات لە خۆت بێ •

کۆڤالیۆڤ دانیشت • ئیڤان یاکۆڤلێڤیچیش خاولیی بەسەر سنگ‌و شانیدا داو لە چاوتروو کاندنێکدا بە فڵچە سابوونی لەوچەشنەی لە جەژنی لەدایك‌بوونی بازرگاناندا بۆیانی بەکاردێنن ، لە ڕیشی‌و بەشێکی ڕوومەتی هەڵسوو •

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ تەماشایەکی لووتی کۆڤالیۆڤی کردو لە دڵی خۆیدا گوتی : چاوت لێ‌یە ! جا سەری بۆ لای ئەولای بردو لەلاوە سەیرێکی‌کردو لەبەرخۆیەوە گوتی : خۆیەتی ! سەیرە • ئەمە لەکوێوە پەیدا بوەوە ؟ ماوەیەکی زۆر هەر سەیری‌کرد • ئاخری زۆر بە نەرمی‌و لەسەرخۆ دوو پەنجەی خۆی هەڵبڕی بۆئەوەی بەئاستەم سەری لووتەی پێ بگرێ • عادەتی یاکۆڤلێڤیچ لە ڕیش‌تاشیندا وابوو •

کۆڤالیۆڤ قیژاندی : نە •• نە •• نە •• نە •• نە • وریابە !

ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ خێرا دەستی داگرتە خوارەوە • بەجۆرێ شڵەژاو شەرم‌گرتی هەرگیز شڵەژان‌و شەرمەزاریی‌وای بەخۆیەوە نەدیبوو • ئاخری وا لەسەرخۆ دەستی‌کرد بە تاشینی ژێرڕیشی کۆڤالیۆڤ وەك بڵێی بە گوێزان ختووکەی دەدا • هەرچەندە بێ‌دەست‌گرتن بە ئەندامی بۆن‌کردنیەوە زۆر زەحمەت بوو ژێر ڕیشی بۆ بتاشێ ، لەگەڵ ئەوەشدا هەرچۆنێ بوو بەهۆی پەنجە گەورەیەوە کە دەینا بە ڕوومەت‌و چەناکەیەوە ، توانی لەو کۆسپە گەورەیە ڕزگار بێ‌و لە تاشینی ڕیشی بێتەوە •

کە ئەمە هەمووی بڕایەوە ، کۆڤالیۆڤ دەس‌بەجێ بەپەلە خۆی گۆڕی‌و عەرەبانەیەکی گرت‌و ڕاستەو ڕاست چوو بۆ دووکانێکی شیرینی‌فرۆشی • هەر

که پێی نایه ناو دەرگاکەوه هاواری له شاگردی دووکانەکه کرد کـه هێشتا لێشی دوور بوو : « ئا کوڕه فنجانێ کاکاو ! » و خۆی بەرەو لای ئاوێنەکەوه چوو ، سەیرێکی کرد ، بینی لووتی له جێـی خۆیەتی • به دڵێـکی شادەوه گەڕایه دواوەو به شێوەیەکی گاڵتەپێکەرانه به قنگی چاو ڕوانییه دوو ئەفسەر دانیشتبوونو یەکێکیان لووتی هەر هێندەی دوگمەی کراسێك دەبوو • که لەوێ هەڵسا چوو بۆ ئەو دائیرەیه که هەوڵێکی زۆری تێـدا دابوو بیکەنه جێـگری شاردارو ، ئەگەر هەر نەبوو بیکـەن بـه چاودێر له بەڕێوەبەرێتییەکدا • له ژووری پێشوازیی دائیرەکەدا به لاچاوێك سەیری ئاوێنەی کـرد ، بینـی له سایەی خواوه لووتی له جێی خۆیدایه ! لەوێشەوه چوو بۆ لای هاوڕێیەکی له قوتابخانەی فەرمانبەران دەرچووی ، یاخـود هاوڕێیەکی مێجـەری کـه کابرایەکی زۆر قۆشمەو گاڵتەچی بوو و گەلێجار له وەڵامی گاڵتەپێکردنو زۆر لەسەر شت ڕۆیشتنیدا پێیدەگوت : « من زۆر باشت دەناسم ، هەی دڕك! »• به ڕێگاوه بیـری لەوه دەکردەوه : « مێجەر که بینیمی ئەگەر لەبەر پێـکەنین شەقی نەبرد ، ئەوه نیشانەیەکی ڕاستی ئەوەیه که لووتم له جێی خۆیدایەتی »• بەڵام مێجەر هیچی سەرنج نەداو ئەمیش له دڵی خۆیدا گوتی : با بڕوا ، ملی دەشکا ! هەر له ڕێگادا تووشی خاتوو پۆدتۆچینای ژنه باش ئەفسەرو کچەکەی بوو و له بەردەمیاندا سەری ڕێزی دانەواندو ئەوانیش به خۆشیو شادییەوه پێشوازییان لێ کرد • بەوەدا دڵنیا بوو کەوا هیچ ناتەواوییەکی تێدا نییه • ماوەیـەکی زۆر قسـەی لەگـەڵ کـردنو بەئەنقـەست قوتـووی برنووتییەکـەشی دەرهێنـاو هـەر جـاره کونەلووتێـکی دەنایـه سەریو هەڵیدەمژی • خۆیشی لێ دەبردنـه پێشەوەو باسی خۆیی بۆ دەکـردن • لەبەرخۆیشیەوه دەیگوت : « گەلی ژنان ، هەموتان وەك یەك وان ! ئەقڵتـان

هێندەی ئەقڵی مامرێکە ! کچەکەت ناهێنم • ئەوە لە مێشکی خۆت دەرکە • بەڵام ئەگەر مەسەلە هەر دڵداریو ڕابواردن بێ ، قەیدناکا ، قایلم ! » •

ئیتر لەوکاتەوە مێجەر کۆڤالیۆف وەك نە بای دیبێو نە باران ، هەموو ڕۆژێ بە شەقامی نێفسکیدا پیاسەی دەکردو دەچوو بۆ شانۆو سەری لە هەموو شوێنێك دەدا • لووتیشی لە هەموو کاتێکی ڕابواردوو چەسپتر بە شوێنی خۆیەوە لکابوو ، تەنانەت هیچی ئەوتۆشی پێوە دەرنەدەکەوت وابگەیەنێ ڕۆژێ لە ڕۆژان لێی جیابووبوەوە • ئیتر مێجەر کۆڤالیۆف هەمیشە بە ڕوویەکی خۆش‌و دڵێکی گوشادەوە دەبینراو ، بەدوای هەموو ئافرەتێکی شۆخ‌و نازداردا دەگەڕاو بەدەوریاندا دەخولایەوەو بۆیان دەخەنییەوە • تەنانەت جارێکیشیان لە بەردەم دووکانێکدا لە بازاڕی « گۆستینی دڤۆر » وەستا زریزەیەکی مەدالیای کڕی کە کەس نازانی بۆچ کڕیی ؟ چونکە خۆی هەرگیز مەدالیای وەرنەگرتبوو •

سەیری چ سەرگوزەشتەیەك لە پایتەختی باکووریی وڵاتە پانو بەرینەکەی ئێمەدا ڕوویدا ! ئێستاش کە وردەبینەوە دەبینین گەلێ شتی لە ڕاستییەوە دووری تێدایە • با لەوەش گەڕێین کە شتێکی زۆر سەرسووڕهێن‌و ناتەبیعییە لووتێك لە جێی خۆی بپێتەوەو لەم‌لاو لەولا لە شێوەی ڕاوێژپێکراوی شارستانیدا خۆی پیشان‌بدا • بەڵام ئەی کۆڤالیۆف چۆن هەستی بەوە نەکرد کە نابێ لە ڕێی ڕۆژنامەوە لەبارەی لووتیەوە جاڕنامە بڵاوبکاتەوە ؟ من لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە بڵێم بڵاوکردنەوەی جاڕنامە لە ڕۆژنامەدا پارەی زۆری تێدەچێ • ئەوە قسەی هیچەو منیش بە هیچ کلۆجێ لە ڕیزی کەسانی پارەپەرستدا نیم • بەڵام کارەکە جوان نییە ، ڕاست نییە ، باش نییە ! دیسان هەروەها لووت چۆن کەوتە ناو کولێرەی گەرمەوەو ، ئیڤان یاکۆڤلێڤیچ

چۆن توانی •••؟ نەخێر ! من لەمـە هیـچ حاڵی نابم • بێ پێچ‌وپەنا دەیڵێـم تێ ناگەم ! بەڵام ئەوەی لە هەمووی سەیرو سەمەرەترەو لە هەموو شتێ نادیارتر، ئەوەیە بنووسان چۆن دەتوانن ئەم جۆرە بابەتانە بکەن بە کەرەستەی نووسین ؟ من پێی‌لێ‌دەنێم ئەمە بەتـەواوی مەسەلەیەکە وێڵ توانای ئـەوەی نی‌یـە لێی تێ‌بگا •• ئا ئەمە دەق •••• نەخەیر ، من هیچ لەمە ناگەم • یەکەم ، بێ گومان هیچ کەڵکێکی بۆ نیشتمان تێدا نی‌یە • دووەم •• دووەمیش هیـــچ سوودێکی تێدا نی‌یە •• بەکورتی من نازانم ئەمە چی‌یە ؟!

هەرچۆن بێ‌و •• لەگەڵ هەموو ئەوەش کە گێڕامانەوەو ، هەرچـەند دەکرێ بگوتـرێ شتی‌وا ڕوودەداو ، شتی‌تریش ڕوودەداو ، شتی دیکـەش لەوانەیە ڕووبدا ، تۆ بڵێ ئاخر لەکـوێ شتی قۆڕو نابەجێ ڕوونادا ؟ لەگـەڵ هەموو ئەمەش ، کە لێکی‌دەدەینەوە لە هەموو ئەمەدا شتێکی ڕاستیش هـــەر دەبینینەوە • کـێ چـی دەڵێ ، با بڵێ •• هەرچـــۆن بـووە ، لـەم‌جۆرە سەرگوزەشتانە ، با کەمیش ڕووبدا ، لە جیهاندا هەر ڕوودەدا •

١٨٣٦

چارەوێکان بەسەر هەورازو لێژەکاندا تیژ تێدەپەڕن ،
قوول ، بەفر دەشێلن ...
ئەوە میحرابی خوایە لە لاڕێوە
بەتەنیا دیارە .

. . . . . . . . . . . . .

لەناکاو کڕێوە بە چوار دەوردا ،
کلووە بەفری گەورە گەورە دەهێنێ ؛
قەلەڕەش شەقەی باڵی دێ ؛
بەسەر عەرەبانەدا دەخولێتەوە
هەموو شتێ دەنگی ماتەم دەگەیەنێ !
چارەوێکان بەپەلەن
وریا دەڕواننە ڕەشاییی دوورو ،
یالیان گرژدەکەنەوە ...

.

« ژووکۆفسکی »

لە کۆتاییی ساڵی ١٨١١دا ، لە سەردەمێکـدا کـە شایانی ئەوەیە هێشتا لەیادمان بێ گاڤریڵ گاڤریلۆڤیچ پ....ی پیاوچاکو میهرەبان لە (نێنا ڕادۆڤۆ)ی موڵکی خۆیدا دەژیا . گاڤـریڵ گاڤریلۆڤیـچ لـە سەرانسەری ناوچەکـــەو دەوروبەریدا بە خاوەن دیوەخانو دەستگوشاد ناوی دەرکردبوو ، دراوسێکانی بێوچان بۆ خواردنو خواردنەوەو یاریی باستۆن کردن لەگەڵ ژنەکەی لەسەر پێنج کۆپێك ـ دەهاتنە کنـی . هەندێکیش بۆ ئـەوە دەهاتن تەماشای ماریـــا گاڤریلۆڤنای کچی بکەن کە کچێکی باڵا ڕێکوپێکی کەمڕەنگی حەڤدە ساڵان بوو . بووکێك بوو جیازیو پارەیـەکی باشی بەدەمەوە بوو و زۆر کـــەس

دەیانویست بۆ خۆیان یان بۆ کوڕیانی بخوازن •

ماریا گاڤریلۆڤنا بە ڕۆمانی فەرەنسەیی پەروەردە درابوو و لە سەرئەنجامی ئەمەدا بە داوی دڵداری‌یەوە بووبوو • ئەوەی هەڵی‌بژاردبوو ئەفسەرێکی یەك ئەستێرەی هەژار بوو ، بۆ پشوو هاتبوەوە گوندەکەی خۆیان • دیارە کەوا کوڕە لاویش بە هەمان ئارەزووەوە دەسووتاو دایكو باوکیشی بەوە شادمان بوون•بەڵام کە دایكو باوکی کچەکە هەستیان بە دڵبەیەکداچوونی ئەو جووتە دڵدارە کرد ، تەنانەت ڕێگەی ئەوەشیان لە کچەکەیان قەدەغە کرد کە بیری لێ‌بکاتەوەو ، کوڕەشیان لە کوێخای لەکارخراو خراپتر میوانداری دەکرد •

جووتە دڵدار نامەیان بۆ یەکتر دەنووسی‌و گەلێ ڕۆژیش بەتەنها لە دارستانە کاژەکاندا یان لای کڵێسە کۆنەکەوە چاویان بە یەك دەکەوت • لەوێدا سوێندی خۆشەویستیی هەمیشەیی‌یان بۆ یەکتر دەخواردو گلەیی‌و بناشتیان لە چارەنووس دەکردو بیرو خەیاڵی جۆربەجۆریان دەکردەوە • نامەنووسین‌و قسەکردن بەم‌چەشنە [ دیارە هەر واش دەبێ ] گەیاندنیە ئەم لێکدانەوەیە کە ئەگەر ئێمە نەتوانین بێ‌یەکتر هەناسەبدەین ، بەڵام دڵڕەقی‌و زوڵمی دایكو باوك بووبێتە کۆسپ لەڕێی سەرکەوتنماندا ، تۆ بڵێی نەشتوانین لەمە ڕزگار ببین ؟ بێ‌گومان ئەم بیری بەختەوەریی ڕزگاربوونە لەپێشدا بە مێشکی لاوەکەدا هات ، بەڵام شێوە ڕۆمانتیکی‌یانەکەی بەتەواوی بە دڵی ماریا گاڤریلۆڤنایش بوو •

زستان هاتو چاوبەیەك‌کەوتنیان نەما • بەڵام نامەنووسین گەشەی سەند • ڤلادیمیر نیکۆلایڤیچ لە هەموو نامەیەکیدا لە ماریا گاڤریلۆڤنا دەپاڕایەوە ڕازی ببێ بەنهێنی مارەی ببڕێ‌و ماوەیەك دەنگ‌نەکەن‌و بیشارنەوەو دوایی بەسەر

دەستو پێی دایكو باوكیدا بكەونو ، بێ گومان قارەمانێتیی هەمیشەیی‌و كڵۆڵیی دڵدارانیش سەرەنجام كاز هەر دەكاتە سەر دایكو باوكی‌و ئەوسا بە دڵ لە باوەشمان دەگرن .

ماریا گافریلۆڤنا تا ماوەیەكی زۆر هەر دوودڵ بوو ، بەڵام لەكۆتاییدا ملی‌دا . لە ڕۆژی دیاری‌كراودا دەبوو نانی ئێوارە نەخواتو بڕواتە ژووری خۆی‌و وا پیشان‌بدا كەوا تووشی ژانەسەر بووە . كارەكەرەكەی لەم پیلانەدا بەشدار بوو ، دەبوو لە دەرگای دواوە بچنە باخەكەو سواری ئەو عەرەبانەیە بن كە بۆیان ئامادە كرابوو و لە ( نێنا ڕادۆڤۆ )وە پێنج فرسەق بڕۆن تا دەگەنە گوندی ( ژادرینۆ )و لەوێ ڕاستەوخۆ بۆ كڵێسەو دەبوو ڤلادیمیر لەوێ چاوەڕوانی‌یان بكات .

شەوێ پێش ئەوەی ماریا گافریلۆڤنا ئەم هەنگاوە بنێ ، تا سبەینێ حەو نەچوە چاوی . شتومەكەكانی كۆكردەوە ، كەل‌وپەلی هەموو خستە بوخچەرە، نامەیەكی دوورو درێژی بۆ دەستە خۆشكێكی پڕهەستی نووسی . نامەیەكیشی بۆ دایكو باوكی نووسی ، بە جوانترین‌و ناسكترین وشە ماڵاواییی تێدا لێ كردنو ، داوای لێ‌خوش‌بوونیشی لەو تاوانە لێ كردبوون كە هێزی ئەڤین پێی‌كردنو ، كۆتاییی نامەكەی بەوە هێنابوەوە كە بەختەوەرترین ساتی ژیانی ئەودەمەیە كە ئەوان ڕێی‌بدەن بەسەر دەستو پێ‌یاندا بكەوێ .. هەردوو نامەكەی پێچایەوەو وێنەی دوو دڵی سووتاوی لەسەر كردنو بەجوانی لەسەری‌نووسین . كەمێك بەرلەوەی شەبەق‌بدا چووە سەر جێگەكەی ڕاكشا ، خەریك‌بوو خەوی لێ بكەوێ ، بەڵام ئاواتی پڕمەترسیی هەر ئەوكاتە گورج خەوەكەی لەبیر بردەوە . وا دەهاتە پێش چاوی هەر كە سواری عەرەبانەكە دەبێ بڕوا بۆ مارەبڕان ، باوكی دەست‌بەجێ ڕای‌دەگرێ‌و بەخێرایی بە سزاوە

بەسەر بەفرەكەدا ڕای‌دەكێشێ‌و فڕێی‌دەداتە زیندانێـــكی تاریك‌و بێ‌بنـــی ژێرزەوی ··· بەهــەڵەداوان دەڕۆیشت دڵی خۆشەویستەكــەی بداتــەوە ، دەبینی ڤلادیمیر لەسەر سەوزەگیایــەك ڕاكشاوە ، ڕەنــگ زەرد ، خەڵتـانی خوێنە ، خەریكە دەمرێ‌و بە نووزەیەكی بەئاستەم لێی دەپاڕێتەوە دەست‌وبرد بكا بۆ مارەكردنی ·· شت‌و شێوەی ترسناك‌و سامناك یــەك لەدوای یەك بــە بەرچاویدا دێن‌و دەچن · لەدوایدا هەڵستا ، كەم‌ڕەنگتر لەوەی كــە هەیــەو بە ژانەسەرێكی ڕاستەقینەوە · دایك‌و باوكی هەستیان بە پەشۆكاویی كچەكەیان كرد · بە هەستێكی ناسك‌و بەبایەخ پێدانەوە بێ‌وچان لێ‌یان دەپرسی : ماشا[1] چیتە؟ خۆ نەخۆش نیت؟ خەریك‌بوو دڵی بپچڕێنن · ماشا هەوڵی‌دا دڵیان‌بداتەوەو هێدی‌یان بكاتەوەو وایان پیشان‌بدا كە دڵی خۆشە ، بەڵام نەیتوانی · ئێــوارە داهات · بیركردنەوەی لەوە كـــەوا ئەوڕۆژە دواڕۆژیـــە لە ماڵی خۆیاندا بەسەری‌دەبا ، دڵی تووشی شەرمەزاری دەكرد · بەئاستەم گیانی تێدا مابوو · بەنهێنی ماڵاوایی لە هەموان‌و لە هەموو دەوروبەری كرد ·

نانی ئێوارە دانرا · ماریا دڵی تووشی ئازارێــكی سەخت بوو · · بــە دەنگێكی هەنسكاوی‌یەوە بە دایك‌و باوكی ڕاگەیاند كەوا شێوی بۆ ناكرێتەوە · خواحافیزیی لێ كردن ، ئەوانیش ماچیان‌كردو دوعای خێــریان بۆ كــرد · ئەوەندەی نەمابوو دەست‌بكا بە گریان · كاتێ كە چووە ژوورەكەی خۆی ، خۆی‌دا بەسەر كورسی‌یەكداو دایە فرمێسك هــەڵڕشتن · كارەكەرەكــەشی كەوتە دڵدانەوەی ، بەسەریدا دەهات‌و دەیهێنایەوە سەر خۆی · هەموو شتێ ئامادە بوو · دەبــوو پاش نیوسەعات ماشــا بەیــەكجاری ماڵی باوانی ، ژوورە

(١) بچووك‌كراوەی ناوی مارییایە ، بۆ خۆشەویستی ــ وەرگێڕ ·

خنجیلانەکەی ، ژیانی هێمنی کچێنیی خۆی بەجێبهێڵێ • لەدەرەوە بەفـــر کرێوەی دەکرد • با دەیلووراند • دارو دیوار ناڵەو شەقەیان دەهات • هەموو لە هەڕەشەو نیشانەی چاوەڕوانیی ماتەم دەچوون • زۆری نەبرد ماڵ کش‌وەات بوو ، هەموو خەویان لێ کەوت • ماشا لەچکی لەسەریەوە پێچا ، پاڵتۆی گەرمو نەرمی لەبەرکرد • نقێمدانەکەی گرت بەدەستیەوەو لە دەرگای پشتەوە لە ماڵ چووە دەرەوە • کارەکەرەکەشی بە دوو بوخچەوە شوێنی‌کەوت • چوونە ناو باخەکەوە • کرێوە سووکی نەکـرد • با بەرەوڕوویان دەهات ، وەك هێــزی ئاسمان بی‌یەوێ تاوانبارێکی لاو گل‌داتەوە • بـە هەزار حاڵ خۆیان گەیانـدە ئەوسەری باخەکە • لەسەر ڕێگاکە عەرەبانەکە چاوەڕوانیان بوو • ئەسپەکانی وا تەزیبوون جێ‌یان بە خۆیان نەدەگرت • عەرەبانەچی‌یەکەی ڤلادیمیر ڕەشمەو لغاوی ئەسپەکانی باش گرت • یارمەتیی بەگزادەو کارەکەرەکەی دا سەرکەونە ناو عەرەبانەکەو بوخچەو نقێمدانەکەی بۆ دانان • جڵەوی ئەسپەکانی شل‌کردو ئەوانیش کەوتنە ڤڕین • لێرەدا بەگزادە دەدەینە دەست چارەنووسی خۆی‌و هونەری تێرێشکای عەرەبانەچی‌و دەگەڕێینەوە بۆ لای لاوی قارەمانی دڵدارمان •

ڤلادیمیر سەراسەری ئـەوڕۆژە لە هـات‌وچوودا بـوو • بەیانی لای قەشەی گوندی ( ژادرینۆ ) بوو • بە هەزار حاڵ توانی قایلی بکا • دوایی چوو لەناو ئاغاکانی دراوسێ گونددا بەدوای شایەتدا بگەڕێ • یەکەم‌کەس کە ڕۆی بۆ لای ( درافین )ی ئەفسەری خانەنشینی چل ساڵان بوو کە بە خۆشی‌یەوە هات بەدەمیەوەو متمانەی‌دایـەو ئەوەی هێنایـەوە یادی کە چۆن زەمانی زوو شۆڕەسوارەکان ئەم جۆرە کارەیان دەکرد • قەناعەتیشی پێ‌کرد کە لای ئەو قاوەڵتی بکاتەوەو دڵنیای کرد کەوا پەیداکردنی دوو شایەتی‌تر وەنەبێ ئەرکێکی قورس بێ • لەڕاستیشدا وابـوو • یەکسەر دوای نانی نیوەڕۆ ( شمیت )ی

سنوورکێش بــه سمێلی پــانو پاژنەی ئاسنیەوەو کوڕی بارچاوەشی گوند که تەمەنی شــازدە ساڵێك دەبــوو و تــازە چووبووە دەورەی ســەربازی‌یەوە ، پەیدابوون • ئەمانە نەك هەر پێشنیهادەکەی ڤلادیمیریان قوبووڵ‌کرد ، بەڵــکو تەنانەت سوێندیشیان بۆ خوارد که ئامادەن لە ڕێگای ئەودا ژیانیان بەخت‌بکەن • ڤلادیمیر لە باوەشی گرتن‌و به دڵخۆشی‌یەوە گەڕایەوەماڵەوە خۆی ئامــادە بــکات •

دەمێك بوو دنیا تاریك داهاتبوو • ڤلادیمیر تێریشکای باوەڕپێ‌کراوی به عەرەبانە سێ‌ئەسپی‌یەکــەی خۆی‌و هەموو تفاقێــکی پێویستەوە ناردبوو بــۆ نێناراودۆڤۆ و خۆیشی بە سواریی عەرەبانە یەك‌ئەسپی‌یەکەی‌و بێ عەرەبانەچی بەرەو ژادرینۆ کەوتەڕێ‌و ، دەبوو ماریا گاڤریلۆڤناش دوای دوو سەعاتێــك بگاتە ئەو شوێنە • شارەزای ڕێگەکە بوو ، هەموو هــەر بیست دەقیقــەیەك دوور بوو •

هەر کە ڤلادیمیر لە گوند دەرچوو و گــەیشتە پێ‌دەشت ، ڕەشــەبا هەڵی‌کردو بووە کڕێوەیەکی ئەوتۆ چاو چاو نەبینێ • لە تەنها دەقیقەیەکدا بەفر ڕێگەو قەراخ ڕێی وەك یەك لێ کرد ، کلووە بەفری سپی‌یش بەجۆرێ گێژی دەخوارد ، هێندەی‌تر دنیای شاردەوە • زەوی‌و ئاسمان تێکەڵی یــەك بوون • ڤلادیمیر لەو دەشتەدا ون‌بوو و هەوڵدانی بۆ چوونەوە سەر ڕێ هەموو بێهوودە بوو • ئەسپەکــەی هەرچەند ملی دەنــا ، یان خۆی‌دەدا بە ڕنووە بەفردا یان دەکەوتە ناو نەواڵە بەفرەوە • عەرەبانەکەش هەر بەم‌لاو بەولادا دەهــات • ڤلادیمیر هەوڵی هەر ئەوەی دەدا ڕێگەکە ون‌نەکات • وای‌دەزانی کە پتر لە نیوسەعات تێــپەڕیوەو کــەچی هێشتا نەگەیشتووەتە دارستانەکەی ژادرینۆ • نزیکەی دە دەقیقەی‌تریش تێپەڕی هێشتا دارستانەکە دیار نەبوو • کڕێوە هێمن

نەبوەوە • ئاسمان ڕوون نەبوەوە • ئەسپەکەی خەریك‌بوو ماندوو بێ • خۆشی ئەگـەرچی تا ناوقەدی لە بەفردا بوو ، گشت لەشـی دڵۆپ دڵۆپ ئارەقی پێدا دەهاتە خوار •

سەرەنجام بۆی دەرکەوت کەوا ڕێی هەڵەکردووە • وەستا • دەستی‌کرد بە بیرکردنەوەو لێکدانەوە • دڵنیابوو کە دەبوو لای ڕاست بگرێ • بە لای ڕاستدا ڕێی گرتەبەر • ئەسپەکەی بە هەزار حاڵ ملی دەنا • پتر لە سەعاتێکی پێ‌چوو تا کەوتەوە سەر ڕێ • دەبوو ژادرینۆ دوور نەبێ • ڕۆیی •• ڕۆیی•• بەڵام دەشت هەر نەبڕایەوە • هەر ڕنوو و نەواڵە بەفر بوو • لەپڕ عەرەبانەکەی هەڵگەڕایەوە ، بەڵام خێـرا هەڵی‌ساندەوە • کـات بەسەردەچوو ، ڤلادیمیر خەریك‌بوو نیگەران دەبوو •

دوایی لە لاوە ڕەشایی‌یەك دەرکەوت • ڤلادیمیـر ڕووی ئەسپەکـەی بەرەو ئەوێ وەرچەرخاند • کاتێ نزیك‌کـەوتەوە دیتی دارستانێکە • بیـری کردەوە : خوا شوکر ! ئیتر نزیکە • بە لای دارستانەکەدا ڕۆیشت ، بەوهیوایەی یەکسەر بکەوێتە سەر ئەو ڕێگەیەی شارەزایەتی یاخود بەدەوری دارستانەکەدا بچێتە سەر ڕێگاکـە • ئەوکاتـە ژادرینۆ لەودیو دارستانـەکەوە بوو • خێرا ڕێگاکەی دۆزی‌یەوە • بەناو ڕەشاییی درەختـە ڕووت‌و قووتەکانی زستاندا ڕۆیشت • **لێرەدا با نەیدەتوانی هێزی خۆی بلاوبکاتەوە** ، ڕێگە تەخت‌و ساف بوو • ئەسپەکە هێزی هاتەوە بەبەرداو ڤلادیمیریش هاتەوە سەر خۆی •

ڤلادیمیر ڕۆیی •• ڕۆیی •• بەڵام ژادرینۆ هەر دیار نەبوو • دارستانیش کۆتایی نەدەهات • ڤلادیمیر کە دیتی خۆی بە دارستانێکدا کردووە لەوەپێش هەرگیز نەیبینیوە ، شڵەژا • بەجارێ هیوای لەبەر بڕا • بەئەسپەکەیدا کێشا • ولاخی بەستەزمان دایە غار ، بەڵام زۆری نەبرد خاوبووەوە • پاش چارەکـە

سەعاتێك بەتەواوی كەوتە لۆقەلۆق • هەرچەند ڤلادیمیری كلۆل هەولی لەگەڵ دەدا دادی نەدەدا •

درەختەكان وردە وردە كەمدەبوونەوە • ڤلادیمیر لە دارستانەكە هاتە دەرەوە • ژادرینۆ هێشتا دیار نەبوو • كات نزیكی نیوەشەو بوو • فرمێسك بە چاوەكانیدا هاتە خوار • گرێی بەختی كرایەوە • بەفرەكە خۆشی كرد • هەورەكان ڕەوینەوە • باكەش كپبووەوە • تا چاو بڕكا دەشتی تەختو ساف دەكشا ، فەرشی سپیی بەسەردا ڕاخرابوو • شەوێكی ئێجگار ڕوونبوو • دیتی وا گوندێكی بچووكی چوارماڵیی لێوە دیارە • بەرەو لای ئەو گوندە ڕێی گرتەبەر • لە بەردەم یەكەم كەوێڵدا بازی لە عەرەبانەكەی دایە خوارەوەو بەرەو لای پەنجەرەی كەوێڵەكە ڕای كردو كەوتە لێدانی • دوای چەند دەقیقەیەك كەبەنكێكی تەختە بەرزبووەوەو پیرەمێردێك ڕیشی چەرمووی خۆی لێ هێنایە دەرەوە :

ـ چیت دەوێ ؟

ـ ژادرینۆ لێرەوە دوورە ؟ چەند دوور دەبێ ؟

ـ ها ، ها •• ژادرینۆ •• دوورە یان نە ؟ دوور نی یە ••دە فرسەقێك دەبێ •

ڤلادیمیر هەر كە گوێی لە وەلامی كابرا بوو ، بە هەردوو دەست دای بە تەپلی سەری خۆیداو كڕوكپ بوو ، وەك یەكێك فەرمانی سێدارە بۆ هەڵخستنی درابێ •

پیرەمێردەكە لەسەر قسەكانی خۆی ڕۆیی :

ـ لەکوێوە هاتووی ؟

ڤلادیمیر گیانی تێدا نەمابوو وەڵامی بداتەوە ، گوتی :

ـ مامە پیرە ! دەتوانی ئەسپێکم تا ژادرینۆ بۆ پەیدا بکەی ؟

پیرەمێردەکە وەڵامی دایەوە :

ـ ئەسپمان لەکوێ بوو ؟

ـ باشە • ئەی ڕێپیشاندەرێك نی‌یە لەگەڵم بێ ؟ چەندی بوێ دەیدەمێ •

پیرەمێردەکە دەستی‌کرد بە دادانەوەی کەبەنگەکەو گوتی :

ـ بوەستە • کوڕەکەمت لەگەڵ دەنێرم •

ڤلادیمیر چاوەڕوانی کرد • دەقیقەیەکی پێ‌نەچوو دیسان لە پەنجەرەکەی دایەوە • ڕیشە دەرکەوتەوە :

ـ چیت‌دەوێ ؟

ـ کوڕەکەت بۆ نەهات ؟

ـ ئێستا دێت • پێڵاوەکانی لە پێ دەکات •

چی‌یە ؟ نەوە سەرماتە ؟ وەرە ژوورەوە • خۆت گەرم‌کەرەوە •

ـ سوپاست دەکەم • پەلە لە کوڕەکەت بکە •

جیرەی دەرگاکە هات • کوڕە بە تێڵایەکەوە هاتەدەرێو بەرەو پێشەوە ملی‌نا ، یان ڕێی پیشان‌دەدا ، یان بەناو بەفرەکەدا بۆ ڕێگا دەگەڕا • ڤلادیمیر لێی‌پرسی :

ـ سه‌عات چه‌نده ؟

کوڕه لاو وه‌ڵامی دایه‌وه :

زۆری نه‌ماوه شه‌به‌قبدا •

ڤلادیمیر ئیتر وشه‌ی له ده‌م نه‌هاته‌ده‌رێ •

کاتێ گه‌یشتنه ژادرینۆ که‌ڵه‌شێر ده‌یخوێندو دنیا ڕووناك بووبووه‌وه • کڵێسه ده‌رگای داخرابوو • ڤلادیمیر کرێی ڕێپیشانده‌ره‌که‌ی داو خۆی چووه حه‌وشی کڵێسه‌که بۆ لای قه‌شه بچێ • له حه‌وشه عه‌ره‌بانه سێ ئه‌سپی‌یه‌که‌ی لێ نه‌بوو • چ‌هه‌واڵێك چاوه‌ڕوانی بوو !

به‌ڵام ، جارێ با بگه‌ڕێینه‌وه لای ئاغا میهره‌بانه‌کانی نێنا ڕادۆڤۆ ، بزانین ئه‌وان له‌چیدان ؟

هیچ !

سبه‌ینێ پیره پیاوو پیرێژن له خه‌و هه‌ستان • چوونه ژووی دیوه‌خان • گاڤریـڵ گاڤریلۆڤیـچ به کلێته‌و چاکه‌تی بازه‌وه ، پراسکۆڤیا پێترۆڤنایش سوخمه‌ی قۆڵدرێژی ناودار له‌به‌ردا••سه‌ماوه‌ر تێخرا • گاڤریڵ گاڤریلۆڤیچ کاره‌که‌ره‌که‌ی نارد بزانێ ماریا گاڤریلۆڤنا چۆنه ؟ ئاخۆ شه‌و باش نووستووه یا نه ؟ کاره‌که‌ره‌که هاته‌وه گوتی به‌گزاده شه‌و زۆر خراپ نووستووه ، به‌ڵام ئێستا باشتره‌و خۆیشی وا دێ بۆ دیوه‌خان • ڕاسته‌کـه‌شی زۆری پێنه‌چـوو ماریا گاڤریلۆڤنا کردی به‌ژووورداو سڵاوێکی له دایکی‌و باوکی کرد •

گاڤریڵ گاڤریلۆڤیچ لێی‌پرسی : « ماشا • ! ژانه سه‌ره‌که‌ت چۆنه ؟ » ماشا وه‌ڵامی دایه‌وه : « بابه گیان ، چاکتره » • پراسکۆڤیا پێترۆڤناش گوتی : « ماشا

وابزانم دوێ ئێوارە تات هەبوو ؟ » • ماشاش وەڵامی‌دایەوە : « دایە گیان ! لام‌وابێ » •

ڕۆژ بە باشی بەسەرچوو ، بەڵام شەو ماشا حاڵی خراپ بوو • ناردیان بۆ شار بەدوای پزیشکدا • پزیشك دەمەو ئێوارە گەیشتە بەرەوە • نەخۆشەکە کەوتبوە وڕێنە کردن • تایەکی ئێجگار توندی هەبوو • نەخۆشی کلۆڵ دوو هەفتە لەسەر ڕۆخی گۆڕ لێی‌کەوت •

لە ماڵەوە کەس لەبارەی ڕەدووکەوتنەکەوە هیچی نەدەزانی • نامەکانی دوێ‌شەو نووسیبوونی هەمووی سووتاندبوون • کارەکەرەکەش هیچی بۆ کەس نەدرکاندبوو نەوەك خـۆی گوناهبار بکـرێ • قەشەو ئەفسەری خانەنشین‌و سنوورکێش‌و کوڕی بارچاوەشی گوندیش هەموو مەردانە بێ‌دەنگ بوون • تێرێشکای عەرەبانەچی‌یش هەرگیز هیچی زیادەی نەدەگوت ، تەنانەت بـە سەرخۆشی‌یش • بەم‌جۆرە نهێنی‌یەکە لەلایەن نیودەرزەن پیلانگێڕەوە پارێزرا ، کەچی ماریا گافریلۆڤنا خۆی لە وڕێنەی بێ‌وچانیدا دەری‌بڕی ، بەڵام قسەکانی هێندە تێکەڵ‌و پێکەڵ بوون ، تەنانەت دایکی کە هەمیشە لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو بە هەزار حاڵ توانی لە سەرپاکی قسەکانی تەنها ئەوەندە تێ‌بگا کەوا کچـەکەی دڵی بە ڤلادیمیر نیکۆلایڤیچەوەیەو لەوانەیە نەخۆشی‌یەکەشی بەهـۆی ئـەو خۆشەویستی‌یەوە بێ •• دایکی ڕاوێژی بە مێردەکەی‌و بە هەندێ لە دراوسێ‌یان کردو سەرەنجام تێکڕا هاتنە سەر ئەو بڕیارە کە دیارە دەبێ چارەنووسی ماریا گافریلۆڤنا لەگەڵ ڤلادیمیر نیکۆلایڤیچ بێ‌و ، هەژاری شوورەیی نی‌یەو ، ژیان لەگەڵ ساماندا نا ، بەڵکو لەگەڵ مرۆڤداو •• لەم‌جۆرە بابەتە قسانەی پەنـدی پێشینان • پەنابردنە بەر پەنـدی پێشینان کەڵـکی ئێجـگار زۆرە ، بەتایبـەتی

لەوحاڵانـەدا کـە ناتوانین بۆ بێتاوان دەرکـردنی خۆمان شتێك لە خۆمانـدا هەڵێنجێنین .

لەوبەینـەدا بەگزادە وردە وردە ڕووی‌کـردە چاكبوونەوە . ڤلادیمیر دەمێ بوو سەری لە ماڵی گاڤریلۆڤیچ نەدابوو . ئەو ترسی ئەوەی بوو پەزێرایی عادەتیی لێ نەکەن ، کەچی ناردیان بەدوایـدا بێت هـەواڵی خۆشی‌یـەکی چاوەڕوان‌نەکراوی بدەنێ : هەواڵی قایل‌بوونیان بەوە کە کچەکەیانی بدەنێ ، بـەڵام ئاغایانی نێنـا ڕادۆڤۆ لەڕادەبەدەر سـەرسام بوون کـە لە وەڵامی بانگ‌کردنەکەیاندا نامەیەکی نیمچە شێتانەیان لە ڤلادیمیرەوە وەرگرت جاڕی تێدا دابوو کەوا هەرگیز پێ بە ماڵیاندا ناکاتو تکای لێ کردبوون ئـەو کڵۆڵە لەبیر خۆیان بەرنەوە کەوا مەرگ بووە بە تاقە ئامانجی .

پاش چەند ڕۆژێك زانی‌یان ڤلادیمیر چووە بۆ ناو سوپا . ئەمە لە ساڵی ١٨١٢دا بوو .

ماوەیەکی زۆر نەیاندەوێرا ئەم هەواڵە بۆ ماشای چاكبووەوە بگێڕنەوە . هەرگیز ناوی ڤلادیمیریان لا نەدەبرد . چەند مانگێك تێپەڕی ، ناوی لە لیستەی ئەو قارەمانانەی شەڕی ( بۆزۆدین )دا بڵاوبووەوە کە سەخت بریندارکرابوون. ماشا کە بەمەی زانی بوورایەوە . ترسیان لـێ نیشت لەرزوتاکـەی پێشووی سەرهەڵداتەوە ، بەڵام لە سایەی خواوە هەر بوورانەوەکە بوو و هیچی‌تری بەدوادا نەهات .

خەمێـکی‌تر بوو بە میوانی ماریا : گاڤریل گاڤریلۆڤیچی باوکی کۆچی دوایی کردو سامانێـکی زۆری لەپاش بەجێما . بـەڵام میراتی زۆر خـەمو پەژارەی نەڕەواندەوە . هەموو بیرو هۆشی لای پراسکۆڤیا پێترۆڤنای دایـکی

بوو • دڵی بۆ ئەو دەسووتا • سوێنـدی خوارد هەرگیـز لێی جیانەبێتـەوە • هەردوکیـان ڕادۆڤۆی جێی یادگـاری غەمگینیان بەجێهێشتەو چوون لـە گوندی ••••• بژین •

ژنخواز لەوێش دەوروخولی بووکی نازدارو ساماندارییان دا ، بەڵام ئەو دڵی بە کەس نەداو کەسی بە هیوا نەکرد • دایکی ناوەناوە بەسەریدا دەهـات کە هاوسەرێك بۆ خـۆی هەڵبژێرێ ، بەڵام ماریا گافـریلۆفنا هـەر سـەری ڕادەوەشاندو بیری دەکردەوە • ڤلادیمیر بەسەر دنیاوە نەماوە • ئەو بـەر لە هاتنە مەیدانی فەرەنسایی‌یەکان ، لە مۆسکۆ کۆچی دوایی کردووە • یادی ڤلادیمیر لای ماشا پیرۆز بوو • بە لای کەمەوە هەموو ئەو شتانەی پاراستبوو کە بۆ یادکـردنەوەی دەشیان : کتێبەکـانیو ئەو وێنانەی کێشابوونیو نۆتەو شیعرو نامەکانی • دراوسێکان کە بەم مەسەلەیان زانی لە دڵ لە دڵ نەدانی زۆر سەرسام بوون • هەر چاوەچاوی ئەو قارەمانەیان بوو کە دێو دوایی بە خەمی خەستی دڵی ئەم گەورەکچە دێنێ •

سەرەنجام شەڕ بە سەرکەوتنـەوە بڕایەوە • تیپەکانـمان لە هەندەران گەڕانەوە • گەل بە هەڵەداوان بەپیریانەوە چوو • مۆسیقا گۆرانیی سەرکەوتن ViVe Henri Ouatre ؟[1] وجۆرەها مۆسیقای دانسو گۆرانیی لێدا • ئەو ئەفسەرانەی بە گەنجی چووبوون بۆ شەڕ ئێستاکە گەڕاونەتەوەو بوونەتە پیاوی بەساڵداچوو • سەربازەکانیش بە خۆشیو شادی‌یەوە لەگەڵ یەك دەدوان• وشەی ئەڵەمانیو فەرەنسی‌یان لە قسەکانیاندا بەکاردەهێنا • کاتەکە لەوانە نەبوو

(١) بژی هنریی چوارەم !

لەبیربچێتەوە • كاتی شانازی‌و سەربەرزی بوو • ئای كە دەگوترا « نیشتمان ! » دڵی رووس چۆن توند لێی‌دەدا ! بە چ‌چەشـنە یـەك‌دڵی‌یەك هەستمان بـۆ سەربەرزیی گەل‌و خۆشەویستیی وڵات كردبوو بە یەك ! ئای بۆ ئەو سەردەمە چ‌سەردەمێك بوو !

ئافرەتی ڕووس ئـەودەمە بێ‌وێنـە بوون • ساردی‌یـە عادەتی‌یەكەیان نەمابوو • كاتێ كە چاویان بە سەربازە سەركەوتووەكان دەكەوت كە هاواریان دەكرد : هووڕا !«وكاسكێتەكانیان هەڵدەدا بە عاسمانا»، شادمانی‌یان شادمانی‌یەكی ڕاستەقینە بوو •

كێ لە ئەفسەرەكانی ئەو سەردەمە پێ لەوە نانێ كـە ئافرەتی ڕووس ، بەش‌بەحاڵی ئەو ، باشترین‌و گرانبەهاترین خەڵات بوو !

لەم كاتە پڕ خۆشی‌و شادمانی‌یەدا ماریا گاڤریلۆڤنا لەگەڵ دایكی دەژیا لە گوندی •••• و ئەوەی بە چاوی خۆی نەدی چۆن هەردوو پایتەخت جەژنی گەڕانەوەی سوپایان دەگێڕا ، بەڵام خۆشیی هەموان ڕەنگە لە گوندو لادێكاندا پترو بەجۆشتر بووبێ • پەیدابوونی ئەفسەر لەو جۆرە شوێنانەدا بۆ خەڵكەكە دەبوو بە جەژن‌و شادی‌یەكی تەواو ، بەڵام بۆ پیاوانی دڵدار خراپ بوو •

پێشتر گوتمان هەرچەندە ماریا گاڤریلۆڤنا سارد بوو ، بـەڵام هەروەك جاران زۆركەس دەوروخولیان دەداو بەتەمای بوون • كـەچی كە بوورمینی سەرگوردی بریندارى میدالیای قارەمانەتی بەسنگەوە كراوو ڕەنگ‌زەرد كەوتە هات‌وچۆی كۆشكەكەیان ، دەبوو هەموان بكشێنە دواوە • وەك بەگزادەكانی ناوچەكە دەیانگوت ئەم لاوە كەم‌ڕەنگە تەمەنی نزیكەی بیست‌و شـەش ساڵ بوو • بۆ پشوودان هاتبووەوە بۆ گوندەكەی خۆیان كە لەنزیك گوندەكەیماڵی

ماریا گـافریلۆڤنـاوه بـوو • ماریـا گافریلۆڤنا ئـەمی لـە خەڵـکی‌تر زۆر جیاکردبوەوە • کە ئەمی لابوایە ، خەمو پەژارەی کەمدەبوەوەو دەگەشایەوە • نەدەکرا بگوترێ کـەوا نازی پێ دەفرۆشێ ، بەڵام کـە شاعیر هەستی بـەم هەڵوێستەی بکردایە دەیگوت :

Se amor non é che dunde ؟ • [1]

ڕاستەکەشی بوورمین لاوێـکی زۆر ڕۆحسووك بـوو • خاوەنی وێڵو فامێکی لەوجۆرە بوو کە ئافرەتان بەدڵیانە : ناسكو ورد ، بێ‌هیـــچ چەشـنە هەڵپەهەڵپو خۆ هەڵکێشانێك ، کەمتەرخەمو قسەخۆش • ڕەفتاری لەگـەڵ ماریا گافریلۆڤنا سادەو ئازادانە بوو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماریا گافریلۆڤنا هەرچی‌یەکی بگوتایە یا بکردایە ، ئەو بە دڵو بە گیان بایەخی دەدایەو لێـی دەکۆڵیەوە • ماریا ، بوورمینی بە مرۆیەکی ڕەوشت بەرزو هێمن دەهاتە پێش چاو • هەرچەند دەنگ وا بڵاو بوو کـە بوورمین زوو کابرایەکی خوێڕی‌و هیچ‌وپووچ بووە ، ئەمە باوەڕی ماریا گافریلۆڤنای بەرانبەری لەکەدار نەکردە ڕێی ئەوەی لێ نەگرت [ وەك هەموو ئافرەتێـکی گەنج ] زات‌بـکا بەوپـەڕی خۆشی‌یەوە لێی ببوورێ •

بـەڵام پتر لە هەرشتێـکی ئەم ئەفسەرە لاوە ( پتر لە ناسکی‌یەکەی ، لە دەم‌ودووی خۆشی ، لە جوانیی کەمڕەنگی‌یەکەی ، لە دەستی هەڵبەستراوی ) ؛ پتر لە هەموو ئەمانەی ، دەنگ‌نەکردنەکـەی ئارەزووی ماریای بزواندبوو • بۆیە نەیتوانی خۆی بگرێو پێی‌نەڵێ کەوا حەزی لێ کردووە • دیارە هەرو ئەویش بە فامو دنیادیدەیی خۆی توانیبووی هەست بەوە بکا کە لەناو هەمواند

(١) ئەمە ئەگەر ئەوین نی‌یە ، ئەی چی‌یە ؟

ئەمی هەڵاوێردووە . بەڵام چۆن تائێستا بە هیچ چەشنێك نەیدیوە لە بەرپێدا بکەوێ‌و هێشتا گوێی لە دانپێدانانی نەبووە ؟ چی ڕایگرتووە ؟ ترس ، جیانەبوونەوە لە یاری ڕاستەقینەی، ، سەربەرزی ، نازی فێڵبازی ؟ ئەمە بۆ ماریا گاڤریلۆڤنا مەتەڵێك بوو . چاك بیری کردەوەو گەیشتە ئەو ئەنجامە کە دەبێ ترس تاکە هۆ بێ . بڕیاریدا کە بە بایەخپێدانی زۆر یان بەگوێرەی ڕێکەوت‌و تەنانەت بە ڕووی خۆش گەرمی بکا . ئەنجامێکی هەرگیز چاوەڕواننەکراوی ئامادە کردو بە بێ‌خۆڕاگرتن چاوەڕوانی ڕوونکردنەوەیەکی ڕۆمانتیکی‌یانە بوو . نهێنی هەرچی چۆنێ بێ بارێکی قورسە بەسەر دڵی ئافرەتەوە . هەر هیچ نەبێ جموجووڵە سەربازی‌یەکانی بوورمین سەرکەوتنی ئارەزووەکانی ماریای وەدی‌هێنا . بوورمین کەوتە گێژاوی بیرکردنەوەیەکی ئەوتۆوە چاوە ڕەشەکانی بە گڕێکی بەتینەوە بەرانبەر ماریا گاڤریلۆڤنا دەسووتان‌و وابێ‌دەچوو کاتی بەئەنجام گەیشتن زۆر نزیك بێ . دراوسێکان وەك کارێکی بڕیاردراوو بڕاوە لەبارەی شایی‌یەوە دەدوان . هەرچی پراسکۆڤیا پێترۆڤنای میهرەبانیش بوو ، بەختیار بوو کەوا سەرەنجام کچەکەی پیاوێکی شایانی دی‌یەوە .

ڕۆژێکیان پیرێژن بەتەنیا لە دیوەخان دانیشتبوو خەریك‌بوو کارتی ڕیزدەکرد[1] ، بوورمین خۆی کرد بەژووردا‌و یەکسەر هەواڵی ماریا گاڤریلۆڤنای لێ پرسی . پیرێژن وەڵامی دایەوە : « لە باخەکەدایە ، بچۆ بۆ لای ، من لێرە چاوەڕوانت دەکەم » . بوورمین چوو . پیرێژنیش دوعایەکی خێری بەدوادا بۆ کردو لە دڵی خۆیدا گوتی : لەوانەیە هەر ئەمڕۆ مەسەلەکە ببڕێتەوە .

(١) جۆرێکی بەخت‌گرتنەوەیە وەك قاوەگرتنەوەو شەماڵەگرتنەوە ـ وەرگێڕ .

بوورمین ماریا گاڤریلۆڤنای لای ئەستێلەکەوە دۆزی‌یەوە لەسای شۆڕەبی‌یەکدا ، کتێب بەدەستەوەو کراسی سپی لەبەردا وەك قارەمانی ڕاستەقینەی ڕۆمان • پاش چاکوچۆنی ئیتر ماریا گاڤریلۆڤنا بەئەنقەست گوێی نەدایە قسەکانی ئەیویست بەوجۆرە خۆی لە خۆتێ‌هەڵقورتاندنی ئەو ڕزگار بکات ، بەهیوای ئەوەی ئەمە خوایە بەڵکو لەناکاو ڕازی دڵی خۆی بۆ دەرخا • هەر واش‌بوو : بوورمین لە بارێکی دەروونیی ئێجگار سەختدا خستی‌یە ڕوو کەوا دەمێکە بۆ هەلێکی‌وا دەگەڕێ بۆئەوەی دڵی خۆی بۆ بکاتەوەو داوای لێ کرد تاوێك بەوردی گوێی بۆ شل‌بکا • ماریا گاڤریلۆڤنا کتێبەکەی پێوەداو وەك نیشانەی بەگوێ‌کردن چاوەکانی داخست •

بوورمین گوتی : « خۆشم‌دەوێیت •• ئێجگار زۆر خۆشم‌دەوێیت •• » [ ماریا گاڤریلۆڤنا ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو سەری پتر دانەواند ] • « من لە ڕەفتارمدا بێ‌باکانە خووم بەو ڕەوشتەوە •• بەو ڕەوشتە خۆشەوە گرتووە کە ئەوەتە هەموو ڕۆژێ بتبینم‌و گوێم لە دەنگت بێ » • [ ماریا گاڤریلۆڤنا کۆتاییی « یەکەم نامە »ی[1] هاتەوەیاد ] • « ئێستاش ئیتر تازە درەنگە دژی چارەنووسی خۆم بوەستم • یادی تۆ ، شێوەی جوانی بێ‌وێنەت لەئێستاوە دەبێتە مایەی ئازارو خۆشیی ژیانم ، بەڵام دیسان ناچارم ئەرکێکی گرانی سەرشانم بەجێ‌بهێنم‌و نهێنی‌یەکی ناعادەتیت بۆ ئاشکرا بکەم تا بزانی کۆسپێکی لە دەسەڵات بەدەر لەنێوانماندا هەیە ••• » ماریا گاڤریلۆڤنا بەپەلە قسەکەی پێ بڕی‌و گوتی : « ئەو کۆسپە هەمیشە بووە •• من ناتوانم ببمە ژنی تۆ •• » • بوورمین

(١) یەکەم نامەی سانت – پریۆ ، لە ڕۆمانی بە نامەی ژان ژاك ڕۆسۆ « یۆلیا یان ئێمۆندای نوێ » • لەونامەیەشدا ڕستەیەك هەیە هەر لەم قسەیە ئەچێ کە لێرەدا بە زمانی بوورمینەوە کراوە – وەرگێڕ •

بە دەنگێکی نزم وەڵامی دایەوە : « دەزانم .. دەزانم .. تۆ کاتێ بووە کەسێکت خۆشویستووە ، بەڵام مەرگ‌و سێ ساڵ مەینەتی .. گیانەکەم ماریا گاڤریلۆڤنای میهرەبان ! لە دوا دڵئارامی بێبەشم مەکە .. تۆ ڕازی دەبووی بەختەوەرم بکەی ئەگەر بهاتبایە .. توخوا هیچ مەڵێ .. توخوا بێدەنگ بە .. تۆ ئازارم دەدەی . بەڵێ ، من دەزانم ، من هەستدەکەم ، تۆ دەبووی بە هی من ، بەڵام من کڵۆڵترین کەسم .. من ژنم هەیە !. »

ماریا گاڤریلۆڤنا بە سەرسامی‌یەکەوە تەماشایەکی بوورمینی کرد .

ــ من ژندارم ــ بوورمین درێژەی بە قسەکانی دا ــ وا ساڵی چوارەمە من ژندارم ، بەڵام ناشزانم ژنەکەم کێیەو لەکوێیەو نازانم ئاخۆ ڕۆژێک دەبێ چاوم پێی بکەوێتەوە یان نە ؟!

ماریا گاڤریلۆڤنا هاواری‌کرد : تۆ دەڵێی چی ؟ ئەمە زۆر سەیرە ! قسەبکە .. من دوایی باسی خۆمت بۆ دەکەم .. پیاوی چاك بە بەردەوام بە .

بوورمین گوتی : لەسەرەتای ساڵی ١٨١٢دا دەبوو بەپەلە بچم بۆ ( ڤیلنا ) واتە ئەو شوێنەی تیپەکەمانی لێبوو . ڕۆژێکیان کە هاتمە وێستگە ئێوارەیەکی درەنگ بوو . فەرمانم دا بە زووترین کات وڵاخم بۆ ئامادە کەن . لەپڕ کرێوەیەکی تووش هەڵی‌کرد . خەڵك‌و عەرەبانەچی‌یەکەش ئامۆژگاری‌یان کردم چاوەڕوان بکەم بەڵکو ئەمە خوایە تۆزێ هەڵبرنگێنێ ، بەڵام من بە قسەیانم نەکرد . تێناگەم چ بێئارامی‌یەك بوو تەنگی پێ هەڵچنیبووم ، وام دەزانی یەکێك پاڵم پیوە دەنێ . کرێوەکەش خۆشی نەکرد . منیش خۆم پێ ڕانەگیرا . سەرلەنوێ فەرمانمدا تفاقم بۆ ئامادە بکەن‌و لە تووشترین کاتدا کەوتمە ڕێ . عەرەبانەچی‌یەکە ویستی بە کەنار ڕووباردا بڕوا کە ئەوە سێ

فرسەق ڕێی بۆ کورت دەکردینەوە ۰ بەڵام بەفری زۆر کەناری ڕووباری شاردبوەوە ۰ عەرەبانەچی‌یەکە ئەو شوێنەی بەجێ‌هێشت کە دەیبردینەوە سەر ڕێگا ۰ بەوچەشنە خۆمان لە شوێنێکی شارەزالێ‌نەبوودا بینی‌یەوە ۰ کرێوە هێمن نەبوەوە ۰ ئاگرێکم بەدی‌کرد ، فەرمانم دا بە عەرەبانەچی‌یەکە بەرەو ئەو ئاگرە بئاژوێ ۰ گەیشتینە گوندێك ۰ لە کڵێسەی لە تەختە دروست‌کراوی گوندەدا تیشکی ئاگرێ دیار بوو ۰ دەروازەی کڵێسەکەش لەسەرپشت بوو ۰ لەودیو شوورەکەشیەوە چەند عەرەبانەیەك ڕاگیرابوون ۰ لە بەردەرگاکەشیدا خەڵك دەهاتن‌و دەچوون ۰ چەند دەنگێك هاواریان تێ‌کردین : « بۆ ئێرە ! بۆ ئێرە ! » ۰ فەرمانم بە عەرەبانەچی‌یەکەم دا بۆ لای ئەوان بئاژوێ ۰ یەکێك پێی‌گوتم : « بەخشە ! لەکوێ تۆ وا دواکەوتی ؟ بووکەکە بووراوەتەوە ۰ قەشە داماوە نازانێ چی بکا ۰ ئێمەش خەریك بوو بگەڕێینەوە ۰ خێراکە دابەزە » ۰ بە بێ‌دەنگی لە عەرەبانەکە بازم‌دایە خوارەوەوچوومە ژووری کڵێسەکەوە کە ڕووناکی‌یەکی کزی دوو سێ مۆمی هەبوو ۰ لە سووچێکی تاریکی کڵێسەکەوە کچێك لەسەر سەکۆیەك دانیشتبوو ، کچێکی‌تر ناوچەوانی دەسڕی ، گوتی : « خوا شوکر ! باش بوو گەیشتیت ۰ تۆزێکی مابوو بەگزادە بگەیەنیتە مردن » ۰ پیرە قەشە لێم هاتە پێشەوەو گوتی : « دەفەرمووی دەست پێ بکەین ؟ » ۰ بە شڵەژاوی‌یەکەوە وەڵامم دایەوە : « باوکە ، فەرموون ، دەست‌پێ‌بکەن ، فەرموون ! » ۰ کچەیان هەستاندە سەر پێ ۰ وا هاتە پێش‌چاوم کە وەزعی خراپ نەبێ ۰۰۰ کارێکی خودسەرانەی ئەقڵ‌نەگرتوو و چاوپۆشی لێ‌نەکراو بوو ۰۰ من لەتەنیشت کچەوە ، لە بەردەم مێزە خاچ لەسەر دانراوەکەدا وەستام ۰ قەشە پەلەی بوو ۰ سێ پیاوو کارەکەرێك چووبوونە بن‌باڵی بووکێ ۰ هەموو بەوەوە خەریك‌بوون ۰ لەیەکیان مارە بڕین ۰ پێیان

گوتین : « یه‌كتری ماچ‌كه‌ن ! » ٠ ژنه‌كه‌م ڕووی كه‌م‌ڕه‌نگی تێ‌كـردم ٠ من ویستم ماچی‌كه‌م ٠٠ ئه‌و قیژاندی : « ئای ! خۆی نی‌یه ٠٠ خۆی نی‌یه ! » ٠ كه‌وت‌و بوورایه‌وه ٠ شایه‌ته‌كان به چاوی پڕمه‌ترسی‌یه‌وه ته‌ماشایان ده‌كردم ٠ وه‌رگه‌ڕامه دواوه ٠ بێ هیچ جۆره قۆرتێك له كڵێسه‌كه چوومه ده‌ره‌وه ٠ خۆم هه‌ڵدایه ناو عه‌ره‌بانه‌كه‌و خوڕیمه عه‌ره‌بانه‌چی‌یه‌كه : « لێ‌خوڕه ! » ٠

ماریا گافریلۆڤنا هاواری‌كرد : « ئای خوایه گیـان ! ئه‌ی نازانی ژنـه هه‌زاره‌كه‌ت چیی به‌سه‌رهات ؟ » ٠

بوورمین وه‌لامی دایه‌وه : « نازانم ! نازانم ئه‌و گونده ناوی چی‌یه كه له‌وێ ماره‌م‌كرد ٠ بیرم نی‌یه له كام وێستگه‌وه بۆی چووم ٠ من له‌وده‌مه‌دا به‌رانبه‌ر ئه‌و تاوانه‌م ئه‌وه‌نده كه‌مته‌رخه‌م بووم هه‌ر له كڵێسه‌كه دووركه‌وتمه‌وه خه‌وم لێ كه‌وت‌و سبه‌ینێی ڕۆژی دوایی له وێستگه‌ی سێهه‌م خه‌به‌رم‌بووه‌وه ٠ ئه‌و خزمه‌تكاره‌ش ئه‌وكاتـه له‌گه‌ڵم بوو ، له ڕێدا مرد ٠ وا ئێستا من ئیتـر هیوای دۆزینه‌وه‌ی ئه‌و كچه‌م نی‌یه كه‌وا ده‌ڵڕه‌قانه گاڵته‌م پێ‌كردو ئێستاش وا ده‌ڵڕقانه هه‌قی بۆ كراوه‌ته‌وه ٠

ماریا گافریلۆڤنـا په‌لاماری ده‌ستی داو گوتی : خوایه گیان ! خوایـه گیان ! ئه‌وه خۆت بوویت‌و كه‌چی ناشمناسیته‌وه ؟!

بوورمین ڕه‌نگی هه‌ڵبزڕكاو ٠٠ به‌سه‌ر پێیدا كه‌وت ٠

ن . ف . گوگول و ا . س . پوشکین

# الانف و العاصفة

ترجمهما عن الروسية

**الدكتور عبدالرحمن معروف**

وراجعهما

**محمد الملا عبدالكريم**

بغداد ــ ١٩٨٣



# Н.В. Гоголь А.С. Пушкин

# „Нос" „Метель"

*Перевёл с русского на курдский*
*д-р Абдуль-Рахман Маaруф*

*Редактор курдского текста*
*Мохаммед Мулла Керим*

*Багдад 1983*

